# پوختەی ژیانی پێغەمبەر

صلى الله عليه وسلم

دانانی
مامۆستا مەلا عبدالخالق حسن شوانی

چاپی سێیەم
٢٠٠٩
هەولێر

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك : پوختەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ

بابەت: ئایینی

نووسینی : مەلا عەبدولخالق حەسەن شوانی

کۆمپیوتەر: نوسینگەی هیوا

چاپی : چاپی یەکەم/ ٢٠٠٢ : چاپی دووەم /٢٠٠٧/ چاپی سێیەم/ ٢٠٠٩

شوێنی بلاوکردنەوە: ((کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی))

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٠١)ی ساڵی(٢٠٠٢)ی پێدراوە.

بلاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە

هەولێر – کوردستان – عیراق

(٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣ ٩٤ / - ٠٧٥٠ ١١٨ ١٩ ١٩ / ☎- ٠٦٦ ٢٢ ٣٣ ٨٦٨)

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله وحده و الصلاة والسلام على من لانبي بعده، وعلى اله واصحابه الى يوم لايوم بعده.

من ناوم: عبدالخالق حسن مصطفى شوانی، لەهۆزی شوانو شێخ بزەینم.

ئەم کتێبە لەسەرەتادا باسی رەگو ریشەی پێغەمبەرو باوانیەتی، باسی لەدایك بوونو دایەنیەتی، باسی خووە شیرینەکانو شێوەو چەشنی جەستەی پیرۆزیەتی، باسی یەکەمینەکانی ئیسلامەتیو شەو ڕۆو بەرزبوونەوەیەتی، باسی کۆچو خانەوادەو موعجیزەکانو هاوەڵەکانو گەنجینەدارو بانگدەرو نهێنی دارو ئاڵاهەلگرەکانیەتی، مەرگو فەرهەنگیەتی.

# ڕشتەی پشتی پێغەمبەر (ﷺ)

**خوێنەری هێژا ! ڕشتەی پشتی پێغەمبەر محمد (ﷺ) بەئەم چەشنەی خوارەوەیە :-**

محمد کوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم کوڕی عبدمناف کوڕی قصی کوڕی حکیم کوڕی مره کوڕی کعب کوڕی لؤي کوڕی غالب کوڕی فهر کوڕی مالك کوڕی النضر کوڕی کنانه کوڕی خزیمه کوڕی مدرکه کوڕی الیاس کوڕی مضر کوڕی نزار کوڕی معد کوڕی عدنان[1] ،ئیدی لەئەمە بەدواوە زانایان، کێشە یان هەیە پێشەوا مالیکش بەلایەوە ناپەسندە ڕشتەی پێغەمبەر (ﷺ) بەرز بکەینەوە تادەگاتە پێغەمبەر ئادەم[2].

## ڕشتەی پشتی دایکیشی بەئەم چەشنەیە

محمد آمنه وهب بن عبدمناف بن زهره بن حکیم[3]. ئەمە ڕشتەی ڕاست ودروستی پێغەمبەرە، زانایان هاودەنگن هەروەها هاودەنگن پێغەمبەر (ﷺ) دەچێتە وەسەر پێغەمبەر ابراهیم، بەڵام چۆنیەتی گەیشتنی ڕشتەی پێغەمبەر محمد بە پێغەمبەر (ابراهیم)ە وەتا هەنووکە لەسەر چاوەیەکی دروستەوە وەنەرگیراوە[4].دایك وباوکی پێغەمبەر (ﷺ) لەیەك تیرەن لە (حکیم)ی کوڕی مره بەیەك دەگەن، کە پێنجەمین باپیرەیانە.

# واتای رەگ و ریشەی باوانی پێغەمبەر

عبدالمطلب ناوی (شیبة الحمده) گوایا لەکاتی لەدایك بوونیدا داوی مووی سپی لەسەری هەبووە، هەروا خەلکیش لێی رازی بوونەو ستایشی کراوە. هەندێك لەزانایان گوتویانە کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەگەلْ ئامینەیدایکی دەچێتە مەدینە بۆ دیدەنی خالْوانی، ئەو کات پێغەمبەر (ﷺ) تەمەنی شەش سالاّن دەبێت لەرێگەدا ئامینەخان ئەمری خودا بەجێ دەگەینێ ابو (طالب)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ) لەپەنای خۆی دەنێت و دەی هێنێتەوە، لەبەر ئەوەی پۆشینەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆن وخراپ دەبێت، شەرم دایدەگرێت کەبلێ ئەمە کوری برامە، بەلْکو دەلێت: ئەمە بەندەمە کاتێك عبدالمطلب مەرگی خودای بەجێهێنا تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ)، هەشت سالاّن بوو، پێغەمبەری کردە خاترانە، بۆ نوێژ بارانە، خودا بارانی بۆ باراندن.!!! (٥).

هاشمی باوە گەورەی پێغەمبەر (ﷺ) ناوی خۆی ((عمر)) هەروا (العلاء) لەبەر پلەوپایەی بەرزوبلْندی ئەو. نازناوی بە(هاشم) دەرکردوە واتا نانی تێکوشیووە لەبەر ئەوەی لەکاتی قات وقری خۆراکی بەکۆمەلی ئەوکات داوە.

((عبدمناف)) باوە گەورەی پێغەمبەر (ﷺ) المغیرەبوو لەبنەرەتدا مناف مناە بوو کەناوی بتێك بوو بەمەزنترین بت دادەنرا دایکی ئەم رۆلە جگەر گۆشەی دانابوو بۆ خزمەتی ئەو بتەناو براوە.

(قُصي) باوەگەورەی پێغەمبەر (ﷺ) زید بوو هەندێك ئێژن یەزید بوو نازناوی بوو بە (قصي) چونکە دوور کەوتەوە لەهۆزی خۆی.

(کلاب)ی باوە گەورەی پێغەمبەر حکیم بووە ، هەندێك ئێژن (عروە) بووە، بەڵام کەنازناوی (کلاب)ی پێدراوە، چونکە حەزی لەڕاو بووە ، زۆرترینی ڕاویشی بەتانجیو سەگ بووە.

باوە گەورەی پێغەمبەر(لؤي) زێتر ناوی بەهەمزە هاتووە.

(فهر)ی باوە گەورەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆگەی قورەیشیەکانە بەلای زۆربەی مێژوو زانەکانەوە، هەرکەسێك کوڕی ئەو بێ ئەوە قوڕەیشیە ئەگینا (فهر) ناویەتی نازناوی (قریش)ە چونکە لەئیش وکاری هەژارانی دەکۆڵیەوەو جێبەجێی دەکرد.

باوە گەورەی پێغەمبەرمان النضر( قیس) بووە نازناوی (النضري) پێدراوە چونکە جوانو ڕەند بووە.

باوەگەورەی پێغەمبەر (مدرکة) ناوی عمرو بووە نازناوی (مدرکة)یە، چونکە جێی خۆ هەڵدانەوەو شکۆویتی هەموو باوانیەتی. باوەگەورەی پێغەمبەرمان (إلیاس) هەندێك ئێژن هەمزەی ناوی (إلیاس) پچڕاوەو ژێرە هەندێك ئێژن هەمزە لکاوە، ئەمەش دراوەتە پاڵی چونکە لەتەمەنی پیری، باوکی (إلیاس) بوو[٦].

## لەدایك بوونی پێغەمبەر(ﷺ)

پێغەمبەر (ﷺ) لەدایك بوو لەشاری مەککە، لەبەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممەی ١٢ی مانگی (ربیع الاول) لەساڵی فیلەکە یان لەڕۆژی فیلەکە، هەندێك ئێژن لەپاش ئەم ڕووداوە دڵ تەزێنە، ئەمەش قسەی دروستە لەئەم بارەوە[٧].

ئەم بەرواره ڕێکەوتە دەگەڵ ساڵی ٥٧١ز هەروا ئەو ماڵەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لێی لەدایك بوو ماڵی (ابوطالب)ی مامی بوو[٨].

مامانی پێغەمبەر (ﷺ) (شفاء) بوو دایکی (عبدالرحمن) کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەدایکی بوو، جیا لەهەموو منداڵێك چاوی کردە ئاسمانو دەستەکانی لەچەشنی چوونە کڕنۆش لەسەر زەمین دانا، لەئەم ئاماژانەدا شتی شاراوەو پەنهان

هەیە. منداڵێکی خاوێن و باوێن ئێژن باوەگەورەی لەهەفتەی لەدایك بوونیدا پێغەمبەری سورانە کرد، کەواتە لەئەم دوو وتە دەردەکەوێت باوەگەورەی پێغەمبەر (ﷺ) تەواو کەری سورانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو‌بێت هەندێك ئێژن: جبریل لەئەو رۆژەی سینەی پێغەمبەری شەق کرد، گوشادو بەشی شەیتانی لێ دەر هێنا، لەهەمان رۆژ سورانەشی کرد(٩).

دایەنی پێغەمبەر (ﷺ) أم ایمن بوو کەنیزەی (عبدالله) ی باوکی بوو، ئەم ژنە ناوی (برکة الحبشیة) بوو(١٠).

دەگێرنەوە: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەدایکی بووە گوتی: جلال ربی الرفیع، هەندێك دەڵێن گوتی: (الله اکبر کبیرا والحمد لله کثیرا وسبحان الله بکرة واصیلا) کەواتە دەگونجێ هەردوو زکری کردبێت، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەدایکی بوو ئامینە خانی دایکی ڕووناکی لەجەستەی دەرچوو خۆی گوتیەتی، کۆشکەکانی (بصري)م دی کەشارێکە لەولاتی شام .

هەروا گوتی من لەنێوانی خەوتن و بێداری دابووم، فریشتە هاتە لام و مژدەی لەدایك بوونی پێغەمبەری پێدام، کاتێکیش لەسکم هاتە دەر هیچ ئازارو ئەشکەنجەو ژانێکم نەدیت، وەك ژنان ژان دەگرن لەکاتی منداڵ بوونیاندا.

هەروا ئامینە بێنوێژی لەسەر نەماو ئەو ڕۆناکیەی کە جاران لەرووخساری عبدالله ی باوکی پێغەمبەر (ﷺ) بوو هاتە رووخساری ئامینە خان.

## ڕووداوەکانی شەوی لەدایکبوونی

لەشەوی لەدایك بوونی پێغەمبەر زۆر شتی سەیر ڕوویدا یەکێك لەئەوانە کوژانەوەی ئاگری ئاگر پەرستان، کە لەماوەی هەزار ساڵدا ئەم ئاگرە نەکوژابۆوە.

هەروەها رمانی هەیوانی کۆشکی کسری کە چواردە قاتی لێڕمان.

بەڕووداچوونی ئاوی ساوە، بەڕوداکەوتنی بتەکان، هەروا کاتێك کەوتە سکی

دایکیشی ئەم بتانە بەڕودا کەوتن.

پێغەمبەرمان کاتێک باوکی ئەمری خودای بەجێهێنا لەسکی دایکیدا بوو، ئەمەش قسەی زۆربەی مێژووزانەکانە، هەر لەبەر ئەمەشە ناوی محمدی لێنراوە.

## دایەنەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

ئاهەنگی لەدایک بوونی پێغەمبەر لەڕۆژی هەفتەمی لەدایک بوونیدا ئەنجامدرا، ئەویش کوشتنەوەی مەڕێک بوو لەسەر دەستی (عبدالمطلب) باوەگەورەی ، هەروا پێغەمبەرمان هەشت دایەنی هەبووە هەندێک ئێژن[11] پترە، یەکەمیان (ئامینە) خانی دایکی هەروا (ثویبة) کە نیزەی (ابولهب)ی مامی بوو، لەشادیانەی لەدایک بوونی پێغەمبەرمان (ابولهب) ئەم کەنیزەیەی ئازاد کردووە بۆیەش ابولهب لەڕۆژانی دووشەممەدا ئازاری دۆزەخی لەسەر سووک کراوە[12]، چونکە هەرئەمەندە چاکەیەی بەرانبەر پێغەمبەر (ﷺ) هەبووە ، بەلام لەهەموویان پتر کەشیری دابێتە پێغەمبەرمان (حليمة) بوو.

زۆریش خێرو فەڕی لەپێغەمبەر دیوە وەك: زۆر بوونی شیری مەمکەکانی، کەلەپێش ئەوەی پێغەمبەرمان بکەوێتە دەستی شیری کەمبوو، هەروا پێغەمبەرمان تەنها شیری مەمکی لای ڕاستەی (حليمە)ی دەگرت ، لای چەپانی بۆ براکەی شیری دەهێشتەوە، هەروا (حليمە) گوتی: ئێمە کاتێک بەڕێکەوتین ولاخەکەمان زۆر لەسەرخۆ دەڕۆیشت، لەدوای هەموو کاروانەکان دەڕۆیشت، بەلام کەگەڕاینەوە ولاخەکەمان لەپێش ولاخی هەموویان دایە، لەپێش ئەوەی تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) یش بگاتە دوو سالان لەمەمکم بڕیەوە[13].

## پێغەمبەر (ﷺ) ناوی زۆرە

پێغەمبەر ناوی زۆرن ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گەورێتی ناوبراو کە پێغەمبەر (ﷺ)ە. پێغەمبەرانی لەپێش خۆی ناویان دەزانی، بۆ نمونە عیسا پێغەمبەر گوتی یەکێك بەدوای منەوە دێت ناوی أحمدە[١٤].

## ناوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەقورئانی پیرۆزدا:

(مُحمد، أحمد، الرسول، البشير، النذير، النبي، الشاهد، المبشر، المنذر، الداعي الى الله، السراج، المنير، الرؤوف، الرحيم، المصدق، المذكر، المزمل، المدثر، عبدالله، الكريم، الحق المبين، النور، خاتم النبيين، الرحمة، النعمة، الهادي، طه، يس)[١٥].

## ناوەکانی پێغەمبەر لەفەرموودەدا:

(الماحي، الحاشر، العاقب، المقفي، نبي الرحمة، النبي التوبة، نبي اللاحم، ورحمة مهداة، القتال، المتوكل، الفاتح، الخاتم، المصطفى، الأمي)[١٦].

## ناوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەپەرتوکەکانی پێش ئیسلامدا:

(الضحوك، الحمياط، يارحمطيا، احيد، بارقليط، فارقليط)[١٧].

## نازناوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) :

(صاحبُ التاج، صاحب البراق، صاحب المعراج، صاحب الشفاعة، المصطفى، المجتبى، المزكى)[١٨].

## ناوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە انجیلو تەوراتدا :

الضحوك، بارقليط، فارقليط، احيد، الحمياط يا ياحمياطيا.

خوێنەری هێژا، فەرموو ئەمە سەرگوزەشتەی محمد صادق :

ئەم پیاوە (دیان) بوو زۆر لەقەشە نزیك بوو، بەچەشنێ کلیلی هەموو پەرتوکخانەی کەوتە دەست. ڕۆژێك مامۆستاکەی پێی ڕاگەیاند ئیمڕۆ بەخوێندکارەکان بڵێ: خوێندن نییە، ئەویش سەیری کرد وا خوێندکارەکان مشتومڕیەتیان لەسەر دوو وشە ئەوانیش وشەی (فارقليط، بارقليط)ە هەریەکەیان بەجۆرێ واتای لێك دەدایەوە، محمد صادق دەڵێت: منیش چوومە لای قەشەو ئەمەم بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەم کلیلە بگرە بڕۆ انجیلی یوحنای چوارەم لەبابی ١٤-١٥-١٦ لەئەوێ عیسا پێغەمبەرمان فەرموویەتی: فارقليط دێت ڕۆڵە ئەم فارقليط و بارقليط ە واتا محمدو أحمد، بەڵام من لەترسی کوشتن ناوێرم ئەم باسە بکەم بۆیەش کەپێت دەڵێم لەلای کەس نەیدرکێنی.

جا ئەو محمد صادقەی ئەم چیرۆکەی گێڕاوەتەوە کەخاوەنی پەرتوکی (أنيس اعلام)ە بەهۆیە ئیسلام کەوتە نێو دڵی، خودا ئەم نازەی بەسەردا ڕژاندو موسلمان بوو[١٩].

## حوکمی نازناوی پێغەمبەر (ﷺ)

خوێنەری هێژا! بۆ هیچ کەسێك ڕەوا نیە کەوا نازناوی پێغەمبەر (ﷺ) ی لێبنرێت هەروەك پێغەمبەرمان فەرموویەتی :(تسمو بإسمي ولا تكنّو بكنيتي) (ب.م.ت). واتا ناوتان بەناوی منەوە بکەن، بەڵام بەناز ناوم نەکەن. پێشەوا شافعی فەرموویەتی: بۆ هیچ کەس شیاو نیە کەوا نازناوی پێغەمبەری لێبنرێت وەك (ابو

القاسم). (ابن القيم الجوزية) فەرموويەتی: ناونان بەناوی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوایە، بەڵام بەنازناویەوە قەدەغەیە، بۆ بەڵگە لەسەر ئەم باسە فەرموودەی پێغەمبەرمانە(ﷺ):

ئەنەس دەڵێ: جارێك پێغەمبەرمان لەبازێڕ دەبێ گوێی لەپیاوێك دەبێ پیاوەکە دەڵێت هۆ ابوقاسم! پێغەمبەر (ﷺ) یش وادەزانێ بانگی ئەو دەکەن، کابرا دەڵێت: لەگەڵ تۆم نییە. جا لەپاش ئەمە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سمّوا بإسمي ولاتكنّو بكنيّتي). فتح الباري. بەناوی منەوە ناوتان بنێن، نەك نازناوتان[٢٠].

## باری مرۆڤایەتی لەپێش پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)

خوێنەری هێژا! لەپێش ئەوەی پێغەمبەر خەڵاتی خودای بۆ ڕەوانە بکرێت، کە قورئانی پیرۆزە باری مرۆڤایەتی لەئاستێکی زۆر نزم و پڕلەمەترسی بوو، خەڵك لەشەوە زەنگی نەفامی بوو، ئەو ئایینانەی، کەبەناو زیندووش بوون، وەك مردوو دەهاتنە بەرچاو، هەمووی شێواوو کزو لاواز کرابوون، ئەمە لەلایەك لەلایەکی دی زۆر نەتەوەو وڵاتانی دی بێ ئایین بوون، بەڵگە بۆ ئەم مێژووە، ئایەتێکی قورئانی پیرۆزە کەخودا فەرموویەتی

﴿لَقَدْ مَنَّ اللّهُ عَلَى الْمُؤمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبِينٍ﴾ (آل عمران/١٦٤)

ئەم ئامارە پڕبە پێستە نازێکی خودایەبەسەر ئیمەی مرۆڤەوە، کەوا لەپێش بوونە پێغەمبەری محەمەد (ﷺ) باری مرۆڤایەتی هەژاریو نەخوێندەواری بوو . پیس و چەپەڵی و بێباوەڕی بوو ، شەوزەنگی زۆرو زەبەن و پڕ لەمەترسی بوو بەهۆی هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژگیران نەماو هەر کەسێك هزرو بیری خستە کارجێی و

ڕێیخۆی دۆزیەوە ئاینی دیانەکان پڕ بوو لە خورافاتو پەلوپۆی زێدە کراوو، نویٚ باو. بۆ نمونە، خودا فەرموویەتی (ورهبانیة ابتدعوها) برایان ڕەخنەیەك لەلایەن خوداوە بێت مایەی کرۆکپ بوونو مات بوونی هەموو لایەك سەر باری ئەمەش پێغەمبەری ئیسلام فەرموویەتی (لارهبانیة فی الاسلام) جامن لەئەم وتارە کورتەدا بۆم ناگونجیٚ سەدەها بەڵگە بهێنمەوە لەسەر ئایین دارو بێئاینەکان بەڵکو مشتێکم هێناوە لەهەزارەها مشت[٢١].

هەروەها ئایینی جوولەکە ئەگەر چی ئایین بوو بەڵام پڕ بوو لە خورافات بۆ نمونە: نەژاد گەریەتی باو بوو لەناویاندا ، یا لەکاتی بەجێهێنانی سنوورەکانی خودا تەنها لەسەر بێدەسەلاتەکان ئەم حوکمەیان دەهێنا دی، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اذا سرق فیهم الشریف ترکوه وإذا سرق فیهم الضعیف أقاموا علیه الحد) .

لەدەسەلاتی ڕۆمانو فارسەکانیش هەرمەپرسە، چونکە ئەمان خۆیان بەخودا دانا بوو، دەبوایە کڕنۆشیان بۆ ببرێت، دەبوایە بەشێکی زۆری سامانی هەژارو نەداران بەئەوان بدرێت،کەچی ئەوان نەیان دەتوانی داوای هیچ شتیٚ لەپاشاکان بکەن، نەیاندەهێشت ژن بهێننو بەشوو بدرێن، ئەمەش زلترین ڕێگەیە بۆ بڵاوبوونەوەی دامەن پیسی، نێربازی، خۆ ئەگەر ئاوڕێك بدەینەوە لەبت پەرستی ئەوا سەرت سوڕدەمێنیٚ بۆ نمونە لەولاتی هند سێسەدو سی ملیۆن بت هەبوو، لەناو کەعبەی پیرۆز لە ڕۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەر (ﷺ) (٣٦٠) بتی شکاندو لابرد، هەتا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من کوڕی ژنێك بووم گۆشتی وشککراوی دەخوارد (انا ابن امرأة کانت تأکل القدید) زۆربەی زۆری عەرەبەکان، کچیان زیندە بەچاڵ دەکرد بۆ ئەوەی زاوایان نەبیٚ ، هەروەك خودا فەرموویەتی ﴿وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ * بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ﴾ هەروا مەی خواردنەوە لەدورگەی عەرەبی کارێکی پەسندو باو بوو، دامەن پیسی لەئەو پەڕی زۆری دابوو، لەبەر داوێن پیسی ژن هێنان نەما

بوو، بگرە ژنانی داوێن چەپەڵو پیاوانی داوێن چەپەڵ، ئالایان هەڵ دابوو لەسەر خانوو بەرەیان، بەهۆی ئارەزووبازیو دەست کەوتنی پارە. کاری باشو خراپ لەیەك جیا نەدەکرانەوە ، سوو خواردن کارێکی دروست بوو، دەوڵەمەندەکان بەهۆی ئەم کارە پشتی هەژارەکانیان چەماندبۆوە، مافی ژن هەر لەگۆڕێ نەبوو لەبەر ئەوەی بەچاوێکی ئاژەڵی سەیر دەکرا، مرۆڤ کرابووە کۆیلە دەکڕاو دەفرۆشرا خودا فەرموویەتی: ﴿ فك رقبة، يا او تحرير رقبة﴾ .

کەواتە برایان لەسەر دەستی ئەم پێغەمبەرە ئەم کارانە نەمانو بن بڕ کران . نازانم کتێبی مەولودنامەی شوانیت خوێندۆتەوە یان نا؟ چونکە لەمەولود نامەکەم ئەم باسە دەکەوێتە بەرچاو، هەروا دەیان نوسەر، کەمن شیاوی ئەوەش نیمە لەلایاندا سیپارەش بخوێنم[٢٢]!!

هەروەك لەگفتوگۆی (جعفری ابو طالیب) و(النجاشی) ئەم باسە بەکورتی نوسراوە، ئەمەش دەقە عەرەبییەکەیەتی (كنا قوما اهل الجاهلية نعبد الاصنام ونأكل الميتة ونأتي الفواحش ونقطع الارحام ونسيء الى الجوار ويأ كل القوي منا الضعيف فكنا على ذلك حتى بعث إلينا رسولا منا نعرف نسبه وصدقه وامانته وعفافه) (جعفر) ئەم قسانەی بۆ نەجاشی گوت، پادشا کڕو مات بوو، ، پێغەمبەر (ﷺ) (عرف بالصادق الامين وانه يصل الرحم ويحمل الكل ويكسب المعدوم ويقري الضيف ويعين على نوائب الدهر، ومن هنا انا اقول ان النبي (ﷺ) يكفيه ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾، اذ ليس فوق العظيم عظيم)[٢٣].

# خودا پەرستی پێغەمبەر(ﷺ) لەپێش پێغەمبەرایەتی

بێگومـان خـودای شـکۆمەند دڵـی پێغەمبـەرمانی نـەرمو نیـان کردبـوو بـۆ هەمووکارێکی چاك، ئەوەتا لەشاری مککە ئەم منداڵە بێباوو دایکە ، ناوی بە(محمد امین) دەرکردبوو، جا خودا پەرستی پێغەمبـەرمان لـەپێش بوونـە پێغەمبەرایـەتی ئـەوە بـوو، بـەدوای بەرنامـەی پێغەمبـەرەکانی خـودا دەکـەوت بە تایبـەتی ئاییـنی پێغەمبەر (ابراهیم) . بەڵام ڕۆننەکراوەتـەوە ئاخۆ خودا پەرستیە کەی چۆن چۆنی بـووە؟ ئـەوەی کـەوا زانـراوە سـاڵانە مانگێـك لەئەشـکەوتی (حـراء) بـیری لـەخودا دەکردەوە، ئەم مانگەش دەکەوتە مانگی (رمضانی) پیرۆزەوە، دواتـر دەهاتـە کەعبە هەفت جار بەدەوریەوە دەسوڕایەوە یا ئەوەندەی لەتوانایدا بوایە[٢٤].

## شێوازەکانی سروش(وحي)

برای هێژا! سروش چەندەها ڕێگەی جۆراو جۆری هەیە:

١-یـەکێك لەئەوانـە خـەونی دروسـتە، چـونکە خـەونی پێغەمبـەران، سروشـی خودایـە هـەروەك پێغەمبـەر (ابـراهیم) بـەهۆی خەونـەوە، کێـردی لەسـەر ملـی (اسماعیل)ی جگەرگۆشەی دانا .

٢- یـا فریشـتەی سـروش سروشـەکە دەخاتـە دڵـی پێغەمبەرەکە، بە بێئـەوەی کەوا پێغەمبەرەکە ببینێت .

٣- یافریشـتەی سـروش لەسـەر چەشـنی پیاوێکی ناسـراو، دێتـە بـەر چـاوی پێغەمبەرەکـە لـەکاتی ئـەم سروشـە، هـیچ قەدەغەیـەك نییـە کـەوا ئامـادە بـووانیش سروش خوێند ببینێت.

٤- یا فریشـتەی سـروش لەسـەر خـودی چەشـنی خـۆی ، خـۆی بەپێغەمبەرەکە

نیشان بدات، وەك ئەوەی پێغەمبەر لەشەوی شەورۆ جبریلی دی، شەش سەدباڵی هەبوو.

٥- یا فریشتەی سروش دێتە لای پێغەمبەرەکەوە دەنگی دێت بەڵام وێنەی نییە، ئەمەش ناخۆشترین جۆری سروشە، چونکە پێغەمبەر لەئەم چەشنە سروشە ئارەقە دای دەگرت و ڕەنگی دەگۆڕا .

٦- یابەهۆی ئاخافتنی خوداوە دەگەل پێغەمبەرەکە، بێئەوەی فریشتە بێتە نێوانی خوداو پێغەمبەرەکە، بەڵکو خودا لەپشتی پەردەوە، ئاخافتنی خۆی بەپێغەمبەرەکە ڕادەگەیەنێت[٢٥] .

## سەرەتای سروش

یەکەمین شتی لەسروشی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پێکرد خەونی دروست بوو، پێغەمبەر (ﷺ) هەرخەونێکی دەدی وەك ئاسۆی بەیانی دەهاتە دی، ئەمەش لەتەمەنی(٤٠ )ساڵیدا بوو چونکە ئەم تەمەنە، تەمەنی پێغەمبەرایەتیە، ئیدی لەمانگی (رمضان) سروش بۆ پێغەمبەر هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) لەئەشکەوتی (حراء) بوو، (جبریل) بەسەر شێوەی پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر وگوتی : (إقرأ) پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: من نەخوێندەوارم، ئیدی (جبریل) ڕای گوشی و دووبارە گوتی بخوینە، پێغەمبەر (ﷺ) بەهەمانشێوەگوتی : من نەخویندەوارم لەجاری سێهەم (جبریل) پتر ڕای گوشی و سێ بارە گوتی (إقرا باسم ربك الذي خلق تا ئایەتی مالم یعلم)، پێغەمبەر بۆ یەکەم جار ئەمەی لەبەر کرد، (جبریل) ڕۆیشت و پێغەمبەریش گەڕایەوە ماڵ. بەڵام دڵی لێی دەداو ڕادەچڵەکی، بۆیە بەدەنگەوە هاتەوە ژوورەوەو گوتی داپۆشن ، جالەپاش ئەوەی کەبەخۆی هاتەوە خدیجە گوتی: ئەمە چی بوو؟ ئەویش هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە، خدیجە گوتی ئومێدم هەیە تۆ ببیت بەپێغەمبەر، فەرموو بچینە لای (ورقەی نوفل)، چونکە پیاوێکی بەساڵا

چووەو شارەزای (انجیل)و پێغەمبەرایەتییە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم هەواڵەی بۆ وەرەقە گێڕایەوە، گوتی: هەر ئەمە بوو سروشی بۆ موسا پێغەمبەر دەهێنا [٢٦].

## پچڕانی سروش

ئیدی لەپاش ئەمە، ماوەی دوو ساڵو نیو سروش لەپێغەمبەرمان پچڕا، تارۆژێك لەڕۆژان پێغەمبەر (ﷺ) لەکۆچەکانی (مەککە) هاتووچۆی دەکرد، کاتێك گوێی لەدەنگێك بوو، سەری بەرز کردەوە دەقاو دەق ئەو پیاوە بوو کاتی خۆی لەئەشکەوتی (حراء) سروشی بۆ هێنا. بەگورج و گۆڵی گەڕایەوە ماڵو گوتی (دثروني – دثروني) جا خودا ئایەتی (یاایها المدثر) بۆ دابەزاند تا (ولربك فاصبر) جا لەپاش ئەمە سروش بەردەوام بوو، جاری ئاواش هەبوو ماوەك دەپچڕا، ئاشکرایە کەوا کەسێك ناتوانێ بەربەرەکانێی شارێك بکات، جاپێغەمبەری خودا لە ئەم قۆناغەدا بانگەوازەکەی بەنهێنی ڕاگەیاند ئەمەش سێ ساڵانی خایاند، چونکە خەڵکی شاری (مەککە) نەفامو دوور لەشارستانیو چەندەها خوو و ئاکاری بەدیان پێوە لکابوو، سەرباری ئەمانەش کلیلداری (کەعبە)و بتخانەکان بوون، ئیدی هۆشی ئەمانە ئەوەندە کەم بوو شیاوی ئەوە نەبوون باسی سروشو پێغەمبەرایەتی لەلای ئەمانە بکرێت [٢٧].

## ئەوانەی زوو موسلمان بوون

یەکەمین کەس باوەڕی بەپێغەمبەر(ﷺ) هێنا (خەدیجە)ی خێزانی بوو، هەروا (علی ابن طالب) و (ابوبکر) و (زیدی حارثە) و هەروا چەند کەسێکی ماقوڵو بەناوبانگ وەك (عثمانی عفان)و (زبیری عوام)و(عبد الرحمن ی عوف)و(عبدالله ی مسعود) و(سعدي وقاص)و(طلحە ی عبیدالله) و(ابوذري الغفاری)و(صهیب الرومي) چەندانی دی [٢٨].

## ئاینی ئیسلام بەهۆی شمشێرەوە بڵاونەبۆتەوە

بۆ ئەم باسە فەرمووبزانە کەوا ئەوانەی قین و ناحەزییان هەیە بەرانبەر ئیسلام، هەزارەها پاگەندە هەڵدەبەستن، بۆ نمونە دەڵێن: ئیسلام بەهۆی شمشێرەوە چەسپاوە کەچی دەقی وشەی ئیسلام واتا ئاشتی و سەلامەتی کەچی ئەم ناوە زەقە لێیان بووە بەشمشێرو جەنگ ، بەڵێ بەڵگە ئەمەیە (ابوجهل) یەکێك موسلمان بوایە لەپیاو ماقوڵان رووبەرووی دەبۆوەو پێی دەگوت: ئەگەرو واز لەم ئایینە تازە نەهێنی ئەوا لەپلەو پایەت دەخەین، بەگەمژەت لەقەلەم دەدەین، خۆ ئەگەر بازرگان بوایە دەیگوت برەوی بازرگانی تۆ تازە لەنێو دەچێت پارەو سامانەکەت لێ دەسەنین، خۆ ئەگەر کابراش هەژار بووایە ئەوا ئازاری دەدا، جا بزانە ئەمە بوو زۆر داری زۆرداران، کەچی لەسەر ئەم حالەش هێشتا هەر بەردەوامن لەسەر قەبات و سەبات[٢٩].

## ئاشکرا کردنی بانگەواز

بێگومان تەمەنی بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) نزیکەی خۆی لە ٢٣ ساڵ دا ، تەنها سێ ساڵ بانگەوازەکە بەنهێنی بوو، ئەمەش دیارە لەبەر بەدکاری و نەفامی خەڵکەکە بوو، سێ ساڵ پێغەمبەرمان بەهۆی فەرمایشتی خوداوە کەفەرموویەتی (فاصدع بما تؤمر واعرض عن المشرکین) سورەتی الحجر ٩٤، واتا ئەی محمد ئەم پەیامەو سروشەی خودات ئاشکرا بکەو کار لەکار ترازاوەو لەسەر کاری خۆت بەردەوام بەو ڕشتو سوور بەو باکت نەبێ لەبێباوەڕان ، جا لەپاش ئەم ئایەتە پێغەمبەر چووە سەر کێوی (صفا)و بەدەنگی بەرز بانگی دەکرد ، خەڵکان لەنێو خۆیاندا پرسیاریان کردو گوتیان ئەوە کێیە، گوترا ئەمە دەنگی (محمد)ە ئینجا

کۆبوونـەوەو یەکەبەیەکـە چـوونە لای پێغەمبـەر (ﷺ) و پێغەمبـەر (ﷺ) یـش فـەرمووی ئـەی بنەماڵـەی فیـسار! ئـەی بنەماڵـەی فیـسکە! ئـەی بنەماڵـەی (عبـد المطلب)! ئەی بنەماڵەی (عبدالمناف)! ئەگەر هەواڵتان پـێ بدەمو بلێم وا لەشکرێك لەقەد پـاڵی ئـەم شـاخەوە دەردەچێت ئایـا بـاوەڕم پێناکـەن؟ گوتیـان بـەڵێ، چۆن؟ چونکە درۆمان لـەتۆ[٣٠] نـەدیوە، تۆ ڕاست گۆیت، ئەمینی، فەرمووی : کەواتـە من ڕەوانـە کـراوی خـودام بـۆ سـەر ئێـوە، (ابولهـب) لـەنێو کۆڕەکـەدا بـوو، گـوتی: دەك سەرگەردان بیت! بۆ ئەمە ئێمەت گرد کردەوە؟ بۆیە خودا سورەتی (تبت یدا ابی لهب) ی دابەزانـد، جا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر هـەموو کەسێك فریـوو بدەم ئێوە فریوو نادەم ، ئەگەر درۆ لەگەڵ هەموو کەسێك بکەم لەگەڵ ئێوەی ناکەم، دەسا سوێندم بەخودا جگە لـەخودا، پەرست تـراوی دی نیـە، من ڕەوانـە کـراوی ئەوم بۆ لای ئێوە بەتایبەتی، بۆ لای خەڵك بەگشتی، ئێـوە دەمـرن هـەروەك دەخـەون، زینـدوو دەکرێنەوە هەروەك لەخەو بێدار دەبن، لەسـەر کارەکان لێتـان دەپرسرێتەوە، چاکە بـۆ بەهەشـتو خراپـە بـۆ دۆزەخ، هـەروەك لەسـەرەتا ئامـاژەم کـرد تـەنها (ابـو لهـب) بەتوندی وەڵامی پێغەمبەری (ﷺ) دەدایەوە، ئیـدی نەرمـە نەرمـە ئاژاوە بـەرپا بـوو، پێغەمبەریان ئازارو ئەشـکەنجە دەدا، بەهـەموو چەشـنێ هـەروا باوەڕدارانیـان ئـازارو ئەشکەنجە دەدا، تا کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی کۆچیان کرد بۆ (حەبەشە)و پێغەمبـەر (ﷺ)و بـاوەڕداران گـەمارۆیان خـرا سـەر، بـۆ ئـەوەی بانگەوازەکە بـن بڕبێت، هـەروا پێغەمبەر لە (الطائف) ئازار درا هەتا خوێن لەپێی پـیرۆزی دەهاتـە خـوارەوە، لەسـەر ئەم حالەش هێشتا دەیگوت: (اللهم اغفر لقومي فإنهم لایعلمون) واتا خودا، لەم گەلە نەفامەم خۆش بەو بیانخە سەر ڕێی ڕەوان.

ئەگـەر پێـت خۆشـە ئـازاری پێغەمبـەر (ﷺ) بزانـی، بـۆ ئـەم باسـە سـەیری موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکە، هەر لەم کتێبەی بەردەستت.

# دڵسۆزی پێغەمبەرمان بۆ ئومەتەکەی

خوشك‌و برایانی هێژا !پێغەمبەر (ﷺ) زۆر پەرۆشی ئومەتەکەی بووە ، زۆر خەمخۆرو پەست بووە بەهۆی شکستی ئێمەوە نزای خراپەی لەبەدکاران نەکردووە ، داوای تکای گەورەی لە خودا کردووە بۆ تاوانباران کاتێ چووە (الطائف) هەرچەندە ئەوان هەڕەشەو گوڕەشەیان لێکرد، منداڵە هوردکەیان بەدواوە نا قاچی پیرۆزی بەهۆی دارو بەردی ئەوانەوە خوێنی لێدەتکایەوە، بەڵێ خودا فەرموویەتی ﴿ لقد جاءكم رسول من من انفسكم عزيز عليه ماعنتم حريص عليكم بالمؤمنين رؤف رحيم﴾ کەواتە سۆزو بەزەیی پێغەمبەر (ﷺ)، بزەو خەندەی پێغەمبەر (ﷺ)، خووی شیرینی پێغەمبەر (ﷺ) نزاو پاڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ)، هەر لەبەر خاتری ئومەتەکەی بووە، دەگێڕنەوە لە(ابوهريره) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لكل نبي دعوة مستجابة فتعجل كل نبي دعوته وإني اختبأت دعوتي شفاعة لامتي يوم القيامة، فهي نائلة ان شاء الله من مات من امتي لايشرك بالله شيئا). ب.م.ت. ، واتا: هەموو پێغەمبەرێك گیرابوونی نزایەکی گەورەی بۆ هەیە لەلایەن خودا[٣١]. بەلام هەر هەموو پێغەمبەران پەلەیان کرد لەگیرابوونی نزاکەیان ، منیش نزاکەم دواخست بۆ ڕۆژی دوایی، لەوێدا پێی لەدۆزەخ دەردەچن بەمەرجێ هاوبەشی بۆ خودا دانەنابێت.

هەروا دەگێڕنەوە لە(عبدالله بن عمرو)، ((ان النبي تلا قول الله عزوجل في ابراهيم، رب انهن اضللن كثيرا من الناس فمن تبعني فإنه مني ومن عصاني فإنك غفور رحيم وقال عيسى عليه السلام ان تعذبهم فإنهم عبادك وان تغفر لهم فإنك انت العزيز الحكيم فرفع يده)) .پێغەمبەرمان ئەم ئایەتەی خوێندەوە لەبارەی نێوانی ابراهیم پێغەمبەرو ئومەتەکەی. خودایە ئەم بتانە جەماوەرێکی زۆریان گومڕا کردووە، جا هەر کەسێك بەدوای منەوە بکەوێت، ئەوا من دەبم بە پێغەمبەری، هەرکەسێکیش یاخی بێت ئەوا تۆ بەخشندەو میهرەبانی، عیسا پێغەمبەریش

گوتی: خودایە! ئەگەر سزای خراپیان بدەیت، ئەوا بەندەی خۆتن ئەگەر چاوپۆشی لەتاوانەکانیان بکەیت، ئەوا خۆت لێزانو دەسەلاتداری. بەلام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (الله امتي امتي فبكى ، فقال عزوجل ياجبريل إذهب إلى محمد وربك اعلم فسله ما يبكيك، فأتاه جبريل فسأله فأخبره رسول الله بما قال وهو اعلم، قال الله ياجبريل إذهب الى محمد فقل إنا سنرضيك في امتك ولانسوءك).م.

بەلام پێغەمبەرمان دەستەکانی بەرز کردەوەو گریا، فەرمووی ئومەتم ئومەتم، جا خودا بەجبریلی فەرموو بڕۆ لای محمد، هەرچەند خودای تۆ شارەزایە کەوا داوای ئەو چییە پێی بفەرموو ئەم گریانەت لەچییە؟ پێغەمبەر(ص) لەوەلامی جبریلی دایەوە، خودا فەرمووی : ئەی جبریل بەمحمد بڵێ من قایلی دەکەمو دڵی ناشکێنمو ئیدی با پەست نەبێت بەرامبەر ئومەتەکەی[٣٢].

## هۆزەبانەی ڕۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ)

خوێنەری موسلمان! ڕۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەر، ڕۆژێکی مەزنە، ڕۆژی جیابوونەوەی ڕاستییە لەناڕاستی، جیابوونەوەی باوەڕە لەبێباوەڕی، جیابوونەوەی ئاشتییە لەشەڕانگێڕی، جیابوونەوری ڕووناکی‌یە لەشەوە زەنگ، شیاوو ڕەوای پێغەمبەر (ﷺ)ە، لەئەم ڕۆژەدا یادی ڕەوشتو خووی بکرێت، یادی هاوەلانی بکرێت، یادی بنەماڵەی ئیسلام بکرێت، ئەم یادە نەخرێتە ئەم قالبەی کەوا پێغەمبەر (ﷺ) بەخودی خۆیەوە بەئاماژەی دەقاو دەقەوە ئەم فەرمانەی کردبێت، بەڵکو بخرێتە ئەم دەقەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ما رآه المسلمون حسنا فهو عند الله حسن). واتا: هەر شتێ موسلمانان پێیان پەسند بێت، ئەوا خوداش پێی پەسندە، چونکە موسلمان کە موسلمانە، چۆن دەبێت ڕەوشتو ڕەفتاری دژی خودا بێت، کەواتە ئەمە خاترێکە لەلایەن خوداوە خەلاتی موسلمانان

کراوە[٣٣]. لەبارەی ڕۆژی دووشەممەش، پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد فەرمووی: (ذاك يومٌ ولدتُ فيه وبعثتُ فيه وانزل عليَّ فيه) .م.د. واتا ڕۆژی دووشەممە ڕۆژی لەدایك بوونمە، ڕۆژی بوونە پێغەمبەرایەتیمە، ڕۆژی دابەزینی قورئانە ، لەبەر ئەمانە پێغەمبەر (ﷺ) پێیدا هەڵداوە.خودا فەرموویەتی: (وأما بنعمة ربك فحدث). واتا باسی نازەکانی خودا بکە بەسەرتا ڕژاندوویەتی، گومانی تیادا نییە نازێك نییە لەسەر ئەم زەمیینە، لەنازی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر گەورەتر بێت. هەروا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لما قدم المدينة فوجد اليهود صياما يومُ عاشوراء فقال : ماهذا اليوم الذي تصومونه؟ فقالوا هذا يوم عظيم انجى الله فيه موسى وقومه واغرق فرعون وقومه، فصامه موسى شكرا فنحن نصومه، فقال رسول الله (ﷺ): فنحنُ احق واولى بموسى منكم.ب.م. واتا: کاتێك پێغەمبەرمان کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە، جولەکەکانی ئەوێ بەڕۆژوو بوون، پێغەمبەریش پرسیاری ئەم بەڕۆژوو بونەی لێکردن گوتیان خودا موسی و نەتەوەکەی لەئەم ڕۆژە دەرباز کردووەو فرعەون و نەتەوەکەی لەناو بردووە، پێغەمبەر (ﷺ) لەوەڵامیان فەرمووی: ئێمە لەموسی نزیکترین لەئێوە، ئەمە دەبێتە بەڵگە کاتی دانپانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەم باسە[٣٤].

## گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) لای زانایانی خۆرئاوا

١- (ولیم موير): مێژوو نووسی (ئینگلیزی) لەبارەی پێغەمبەرەوە فەرموویەتی: ئەوەی لەتوانای پێغەمبەردا هەیە، مایەی سەرسوڕمانی هەموو خاوەن هۆشێکە، چونکە تا ئێستا کەسێك نەبووە لەمێژوودا، ئەم هەموو ئەرکە زێڕینەی لەماوەیەکی ئەوەندە کەم لەسەر دەستی هاتبێتە کایەوە.

٢- (غوستاف لوبون ): فەیلەسوف (فەرەنسی) فەرموویەتی: ئەگەر بتەوێت ئەندازەی کاری ناودارەکانی جیهان بخەیتە بەرچاو، ئەوا بۆت دەردەکەوێت محمد

مەزنترینیانە.

٣- (روسو): لەبارەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) دەستمان بگرە بۆ جێی ڕێزو شانازی، ئێمە بەهۆی تۆوە پێمان خۆشە بگەینە مەرگ، یا سەرکەوتن.

٤- (لامارتین) لەبارەی پێغەمبەرەوە فەرموویەتی: محمد لەخودا بچوکترە، لەمرۆڤانیش گەورەترە. واتا پێغەمبەرە[٣٥].

## شوێنە پیرۆزەکانی شاری مەککەو مەدینە

خۆشەویستەکان ئەگەر تەماشای ئەم دووشارە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کەوا زۆر بەڕێزن، نازیان زۆرە لەلای خوداوە ، بەڵێ شاری مەککە شاری پایەك لەپایەکانی ئیسلامە، ئەویش (حەج)ە، ئەم شارە ناوی بە (مكة) و(بكة) (بلد الأمين) هاتووە، پڕە لەشوێنی گرنگ وەك: ئاوی (زمزم) (ابن القيم) فەرموویەتی: گەورەی هەموو ئاوێکە . ئەم ئاوەش بۆ دایکە (هاجەرە واسماعیل) هەڵقولا ئەگینا ئاو لەئەوێدا نەبوو. ئەشکەوتی (الحراء) پێغەمبەر (ﷺ) بۆ یەکەمین جار لەم ئەشکەوتە پەیامی خودای بۆ دابەزی، ساڵانە لەپێش هاتنی سروش لەئەم ئەشکەوتە خودا پەرستی دەکرد.

ئەشکەوتی (ثور) کەپەناگەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو لەکاتی کۆچ، ئەم ئەشکەوتە شەش میل لەمەککەوە دوورە، پێغەمبەر (ﷺ)و (ابوبكر) سێ ڕۆژ لەم ئەشکەوتە مانەوە. (عرفه) واتا چیای (عرفه) ئەمەش یەکێکە لەشوێنە پیرۆزەکان، لەنۆهەمین ڕۆژی (ذي الحجة) حاجی دەبێ لەئەم شوێنە ئامادە بێ. گۆڕستانی (المعلاة) ئەمەش گۆڕی باوانی پێغەمبەر (ﷺ)و دایکی و (عبدالله ی زبیر)و (اسماکچی ابوبكر)و چەندەها پاڵەوانی دی ژنانو پیاوانی ئیسلام . خانووی (الأرقم بن الأرقم) یەکەمین خوێندخانەی سەردەمی یەکەمی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، چونکە بۆ یەکەمین

جار لەمێژووی ئیسلام لەم خانووەدا، سەدەها هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) موسلمان بوون، یەکێك لەئەوانە (عمر بن الخطاب) .

(منى) شوێنێکە لەنزیك شاری (مەککە)، هەفت (کم) لە(مەککە) دوورە، هەر لەکاتی حەج ئاوەدانە، ئەگینا وەك گوندێك ئاسایە، (ابراهیم) پێغەمبەر لەم شوێنەدا فەرمایشتەکانی خودای بەجێ هێنا، واتا سەرگوزشتەی (ابراهیم‌و اسماعیلی) جگەر گۆشەکەی.

(حجر الأسود) لەناو کەعبە دایە، موسلمانان بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، ئەگەر لەتوانایدا هەبوو باماچی بکات، ئەگینا ئاماژە بکات، هەندێك ئێژن ئەم بەردە لەبەهەشت هاتووە.

(کعبە) رووگەی موسلمانانە، ئەو شوێنە پیرۆزەیە کەوا لەسەر دەستی (ابراهیم)و (اسماعیل) پێغەمبەر دروستکراوە[٣٦] .

## شوێنە گرنگەکانی شاری مەدینە

شاری مەدینە یەکێکە لەشارە بەناو بانگەکانی ئیسلام، ئەو شارە بوو پێغەمبەر (ﷺ) بەدەستی خۆی بەشداری بیناکردنی مزگەوتی تیادا کرد، ئەو شارە بوو کە هاوەڵان تیادا سروودی (طلع البدر علینا) یان تیدا دەگوتەوە، ئەم شارە گۆرستانی (البقیع) ی تیادایە، جێگەی سەروەرانی ئیسلام بەتایبەتی پێشەوا (حمزە)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەم شارە مزگەوتی پێغەمبەری تیادایە، ئەم مزگەوتە پێنج دەرگای هەیە لەباکوریەوە دەرگای (السلام – الرحمة– المجیدی) لەلای رۆژهەڵاتەوەش دەرگای (النساء – البقیع) ە ئەم شارە پڕە لەکانی وەك کانیەکانی (تیماء – دومة الجندل – ذو الرمة – وادي القرى – مدین – فدك). هەروا چەند بیرێکی پیرۆزی تیادایە وەك بیری (انس بن مالك – بیری رومة– بیری اعوام). بەڵێ دەنگی (بلال) لەم شارەدا تریشقەی دەهات، پێغەمبەر (ﷺ) ماڵی دواڕۆژی کەوتە

بەر ئەم شارە، هەندێك لەگەڕەكەكانی ئەم شارە وەك گەڕەكی (الخیاطین — البدور — مالك بن انس) ، گرینگترین كشتوكاڵ لەم شارەدا داری خورمایە[37] .

## ئازایەتی پێغەمبەر (ﷺ)

(لما كان یوم بدر اتقینا المشركین برسول الله (ﷺ)اشد الناس بأسا. رواه احمد والبیهقی عن علی). واتا: لەجەنگی بەدری مەزن، ئێمە خۆمان دەدا پەنای پێغەمبەرەوە لەبەر ئازایەتی ئەو .

## ئاخاوتنی پێغەمبەر (ﷺ)

(كان كلام النبي فصلا، یفهمه كل احد ولم یكن یسرد سردا. رواه الامام احمد وابو داود عن ابن ابی شیبة عن وكیع). واتا ئاخاوتنی پێغەمبەر نەرمە نەرمە بوو، هەموو كەسێك تێی دەگەیشت، پەلە پەلی نەدەكرد لەكاتی ئاخاوتندا.

## دادوەری لای پێغەمبەر (ﷺ)

(والذي نفسُ محمد بیده، لو ان فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت یدها).م.ا.ن. واتا: سوێند بەئەوەی گیانی محمدی لەدەستدایە، ئەگەر (فاطمة)ی كچم دزی بكات دەستی دەبڕم.

## بەخشندەیی پێغەمبەر (ﷺ)

(ما سئل رسول الله شیئا قط فقال: لا.ب.م). واتا: داوای هەرشتێ لە پێغەمبەر (ﷺ) كرابایە نەی دەگوت:نا.

## بێفیزی پێغەمبەر (ﷺ)

( لاتطروني كما اطرت النصارى عيسى بن مريم فإنما انا عبد فقولوا عبد الله ورسوله .ب). واتا گەورێتی من وەك گەورێتی دیانەكان لێ نەكەن، چونكە ئەوان زێدە ڕەویان كرد، بەڵكو بڵێن محمد بەندەو ڕەوانەكراوی خودایە.

## خودا پەرستی پێغەمبەر (ﷺ)

(ان رسول الله قام حتى تفطرت قدماه فقيل له اليس قد غفر الله لك ماتقدم من ذنبك وما تأخر؟ قال افلا اكون عبدا شكورا.ت.في كتاب الشمائل). واتا: بەڕاستی پێغەمبەری خودا شەوان ئەوەندەی خودا پەرستی دەكرد، تاكار گەیشتە ئەو ڕادەیەی پاژنەی ئاوسا. پرسیاریان لێكرد؟ ئەی پێغەمبەری خودا ئایا خودا لەتاوانی پاشینەو پێشینەت خۆشنەبووە؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام منیش سوپاسی خودا نەدەمەوە.!!!

## ئابڕووی پێغەمبەر (ﷺ)

(كان النبي اشد حياء من العذراء في خدرها.ب). واتا: پێغەمبەر(ﷺ) لەكیژۆڵەیەكی تازە پێگەیشتوو شەرمنتر بوو.

## زوهدی پێغەمبەر (ﷺ)

(كان يمر بنا هلال وهلال مايوقد في بيت رسول الله (ﷺ) قلت ياخالة على أيّ شيء كنتم تعيشون قالت على الاسودين: التمر والماء.). واتا: ماوەی دوومانگ ئاگر لەماڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) دانەدەگیرسا، جگە لەخورماو ئاو چی دی نەبوو.

## خووی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڵ دوژمنان

(سئل مرة ان يلعن أعداءه، فقال ماجئت لعنا بل رحمة). واتا: جارێ بەپێغەمبەریان گوت: نەفرەت لەدوژمنان بکات، گوتی: خودا منی بۆ بەخشندەیی ڕەوانە کردووە.

## خووی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڵ گیانداران

(دخلت امراة النار في هرة ربطتها فلم تطعمها ولم تدعها تأكل من خشاش الارض). واتا ژنێ لەسەر پشیلەیەك خودا بردیە دۆزەخ، چونکە پشیلەکەی لەبرسان تۆپاند.

## خووی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڵ هەژاران

(اللهم احييني مسكينا وامتني مسكينا واحشرني في زمرة المساكين). واتا: ئەی خودا! بەهەژاری بمژیێنە بممرێنەو، زیندوو بکەوە دەگەڵ کۆمەڵەی هەژاران .

## چاکی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڵ ژنەکانی

(عن عائشة: خيركم خيركم لإهله وانا خيركم لاهلی). واتا: چاکترینتان ئەوەیە: بۆ خێزانەکانی چاك بێت، من لەهەمووتان چاکترم بۆ خێزانەکانم .

## خووی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڵ کوڕەزای

(عن عمر بن خطاب: رايتُ الحسن والحسين على عاتقي النبي فقلت نعم الفرس تحتكما فقال: (ﷺ) ونعم الفارسان هما). واتا: پێشەوا عمر گوتی (حسن)و(حسێن)م دی لەسەر ملی پێغەمبەر (ﷺ) گوتم ئەمە خۆشترین جێیە، پێغەمبەریش فەرمووی ئەوانیش چاکترین کەسن.

## خواردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ)

(عن انس ان النبي (ﷺ) كان يتنفسُ في الإناءِ ثلاثا إذا شرب ويقول هو امرأو أروى). واتا: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك ئاوی دەخواردەوە بەسێ جار دەیخواردەوە دەیگوت: ئەمە بۆ تێراو بوون چاکترە.

## ڕۆیشتنی پێغەمبەر (ﷺ)

(كان النبي إذا مشى تكفأ تكفوا كانما ينحط من صبب. عن على بن ابي طالب). واتا پێغەمبەر (ﷺ) بەچەشنێ دەڕۆیشت وەك ئەوەی لەشوێنێ بێتە خوارەوە.

## خەوتنی پێغەمبەر (ﷺ)

(عن عبدالله بن يزيد عن البراء بن عازب، ان النبي كان إذا اخذ مضجعه وضع كفه اليمنى تحت خده الأيمن وقال: ربي قني عذابك يوم تبعث عبادك). واتا: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك دەخەوت دەستی ڕاستەی لەژێر کوڵمەی ڕاستەی دادەناو دەیگوت: خودایە پەنام بدە لەسزات، لەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.

## خووی گشتی پێغەمبەر (ﷺ)

(كان خلقه القران). واتا خوی پێغەمبەرمان بەپێی پەیڕەوی قورئان بوو.

## بزەی پێغەمبەر (ﷺ)

(مارايت احدا اكثر تبسما من رسول الله. عن عبدالله بن الحرث). واتا کەسم نەدی وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەم بەبزە بێت.

## گاڵتەی پێغەمبەر (ﷺ)

(عن انس بن مالك ان النبي قال له: ياذا الأذنين). پێغەمبەرمان بەئەنەسی گوت: ئەی خاوەن دوو گوێ.

## خواردنی پێغەمبەر (ﷺ)

(عن ابي سعيد الخدري قال: كان رسول الله إذا فرغ من طعامه قال: الحمد لله الذي اطعمنا وسقانا وجعلنا مسلمين). واتا: پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ دەستی لەخواردن هەڵدەگرت دەیفەرموو: سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئێمەی تێر كردو كردوینەتە موسلمان.

## ڕاسپاردەی پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەر بەبەندەكان

بەندەكان براو خوشكانی خۆتانن، خودا خستونیەتە بەردەستتان، ئێوەش باش بن دەگەڵیان لەئەو خۆراكەیان پێ بدەن كەدەیخۆن، لەو پۆشینەی كەدەكەینە بەر، لەبەریان بكەن، زێدە لەتوانای خۆیان ئەركیان بەسەردا مەدەن، ئەگەر كارتان پێسپاردن یارمەتییان بدەن.م.

## چاندنی درەخت بەلای پێغەمبەر (ﷺ) وە

فەرموویەتی: هەر موسلمانێك درەختێك بنێژێت باڵندەیەك، یان مرۆڤێك، یان ئاژەڵێك لێی بخوات، ئەوا چاكەیەكی بۆ دەنووسرێت و خودا پاداشتی دەداتەوە.ب.

## ڕەوانبێژی پێغەمبەر (ﷺ)

خوێنەری هێژا فەرموو دەگەڵ چەندفەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) :

(الدين النصيحة.م). ئایین ئامۆژگاریەو ڕێنمایە.

(إذا لم تستح فاصنع ماشئت.ب). گەر شەرمت نەبێ هەرچی دەیکەی بیکە.

(من حسن اسلام المر تركه مالا يعنيه).ت.ابن ماجة. موسلمانی چاك ئەوەیە، واز لەشتێ بهێنی پەیوەندی بەئەو نەبێت. الغنی غنی النفس. دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی دەروونە.

## کاری پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵەوە

خۆی پێڵاوەکانی لەتەك یەکەوە جووت دەکردو پۆشینەی پینە دەکردو یارمەتی هاوسەرەی دەدا، خزمەتی خەڵکی دەکردو گۆشتی لەگەڵ هاوسەرکەی ورد دەکرد، کارو باری تری رادەپەڕاند.

## بەزەیی پێغەمبەر (ﷺ)

پێغەمبەر زۆر بەبەزەیی بووە، بۆیەش فەرموویەتی: (لايرحمه الله، من لايرحم الناس).

## ڕۆژووی پێغەمبەر(ﷺ)

مانگی واهەبووە لەهەموو ڕۆژەکان بە ڕۆژوو بووە، مانگی واش هەبووە هەموو ڕۆژەکانی خواردووە، ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممەش بەڕۆژوو بووە.

## پێخەفی پێغەمبەر (ﷺ)

ئەو پێخەفەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری دەخەوت لەپێستی خۆشکراوو توێکلی دار خورما پێك هاتبوو.م.ت[٣٨].

## چەشنی جەستەی پێغەمبەر(ﷺ)

پێغەمبەر (ﷺ) بالآی میانە بوو ، بگرە زێتر بەرزی پێوە دیار بوو لەهەمان کاتدا نەهێندە بەرزو نەهێندەش کورت بوو، شانەکانی لەیەکەوە دوور بوون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا سینەی فرەوان بووە. سەری پیرۆزی مەزن بوو، سەری پێغەمبەرمان قەبە بووە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەو پەڕی بیرمەندی. قژی پێغەمبەرمان نەزێدە درێژو لوولبوو، نەزێدە کورت وخاو بوو، درێژی قژی لەنەرمەی گوێچکەی تێنەدەپەڕی لەگێڕانەوەیەکی تردا تێدەپەری، لەگێڕانەوەی تردا هاتووە، قژی گەیشتۆتە ناو شانی کەواتە درێژیو کورتی بەسەر قژیدا هاتووە بەپێی کات ئەو پەڕی کورتی قژیشی لەنەرمەی گوێچکەی زێتر بووە، ابن القیم ئێژی تەنها چوار جار قژی تاشیوە، ئەمانەش لەکاتی حەجەکان بووە هەروەك لەپەرتوکی (المواهب) ئاماژەیەی پێ کراوە.

روخساری پێغەمبەر(ﷺ) گوشادو روناك بوو، بازنەیی خڕ بوو، رەنگی سپی و سوور بوو، بەڵام ئەو گێڕانەوەی کە گوتیەتی ڕەنگی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەشتاڵە بووە مەبەستی ئەوەیە کەوا سورێتی زێتر بووە، لەگێڕانەوەیەکی دیش هاتووەو ئاماژەی کردووە کەوا سپی بووە، مەبەست ئەوەنییە سپی بەتەنها بەڵکو سپی و سوور بووە.

نێوچەوانی پێغەمبەر(ﷺ) فرەوان بوو ئەبرۆی کەوانە درێژو بەیەکەوە نەلکا بوو لەگێڕانەوەیەکدا بەیەکەوە لکا بوو ئەمەش بەپێی نواڕینی تەماشاکار بووە واتا کەلێنی ئەبرۆی ئەوەندە کەمبوو بۆ هەموو کەسێك دەرنەکەوتووە.

لووتی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) درێژو ناوەڕاستی کوڕ بووە، کولمەی ناسكو بێبەرزی بووە، دەمی پیرۆزی گەورەو جوان بووە ددانی بریقە دارو جوان بووە، یا وردو ڕێك بووە، هەروا ددنەكانی شاشیووە بەهەر حاڵ ئەمە كورتەی پوختەی عەرەبییەكە بوو. لەگێڕانەوەی.م.ت، پێغەمبەر (ﷺ) دەمی موبارەكی گەورە بوو، چاوی قەوی‌و جوان بوو، پاژنەی كەم گۆشت بوو، لەشی نەرم بوو، لەشی گۆشتن نەبوو، گرینگترین ئەندامی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو خاڵە بوو كەبەخاڵی پێغەمبەرایەتی ناوزەد كراوە واتە: (مۆری پێغەمبەرلیەتی) كاتێك ئەم پێغەمبەرە مەرگی خودای بەجێهێنا، بیست داوە مووی سپی لەسەر نەبوو.

هەروا هەردوو چاوەكانی گەورەو گلێنە كانی ڕەشێكی تۆخبوو، هەروا چاوەكانی وەك چاوی كلڕێژكراو دەركەوتبوون بێئەوەی كلی تێكردبوایە، پێلوی چاوەكانی درێژ بوون. ریشی پیرۆزی پڕو چڕ بوو، نەزۆر قەڵەو نەزۆر لاواز بوو، سینەی پیرۆزی پان بوو ورگو سكی زلی نەبووە، هەروا ڕان‌و قاچی بەهێز بوون. مەچەكی درێژو نەرم بوون، لەهاوڕیشم نەرم تر بوو، بەڵام لەكاتی پیری تۆزێ قەڵەو بوو[٣٩].

## شەو رۆی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەی خوێنەری بەڕێز! ئەگەر بێت‌و بنواڕینە سەرگوزشتەو سەربردەی پێغەمبەری سەروەر، ئەوا بۆمان ڕۆن‌و ئاشكرا دەبێت، كەخودای شكۆمەند چەندەها ڕێزی مەزنی لێناوە، سوێندی بەتەمەنی پڕ لەخێرو بێری خواردووە هەروەك فەرموویەتی ﴿ لعمرك إنهم لفی سكرتهم یعمهون ﴾[٤٠] سینەی چوار جار لەت كراوە[٤١]، پلەو پایەی بەرزكراوە، شەو ڕۆی پێكراوە لەشاری مكەی خۆشەویست تاكو (بیت المقدس ) لەوێشەوە بۆ هەر هەفت ئاسمان و تەختی خودای گەورە و كورسی ( سدرة المنتهی) ئایا چ گەشتێك هەیە وەك ئەم گەشتە

دوورو درێژو پیرۆز بێت، کەچی بڕینی ئەم هەموو شوێنە، لەهەندێکی شەو بوو، نەك شەوێك بێگومان بڕینی ئەم ڕێگە هەزاران ساڵ دەبات، بەڵام بۆ پێغەمبەر (ﷺ)ی خودا، دەبێت لەهەندێکی شەو بێت ، هەروا کە گەڕایەوە ناو جێگەکەی هێشتا گەرم بوو، لەئەوانەش مەزنتر دەرگەی ژوورەکەی لەکاتی گەڕانەوەی هێشتا زیکە زیکی لێوە دەهات، کەواتە ئەم پرسیارەت لەدڵ ببە دەر، کە چۆن ئەم هەموو ڕێیە دوورەی بڕیوە لەئەو ماوەیە کورتە ؟ باشە ئەی خۆر لەوەتەی هەیە چۆن هەموو ڕۆژێك ئەم هەموو ڕێیە دوورە دەبڕێت و کەچی مرۆڤ لەخۆر گەورە ترە، ئەی ئەگەر مرۆڤەکە پێغەمبەر (ﷺ) بوو ؟ ئەی ئەگەر لەهەموو پێغەمبەرەکان گەورەتربوو ، ئەی ئەگەر جگە لەخودا کەس لەئەو گەورە تر نەبوو !!! کەواتە ئەم روداوە زێڕینە لەنێو دڵی پڕلە بیرو باوەڕی دابنێ چونکە واتای موعجیزە واتا کارێکی لە عادەت بەدەر، دیارە ئەمەش دەبێ لە خوداوە بێت و ئەو کەسەی کارەکە موعجیزەکەی بۆ دەکرێ لەلایەن خودای گەورە دەبێ پێغەمبەر (ﷺ) بێت ! لەم ڕۆژگارە کەوا ساڵی ٢٠٠٧ سەردەم و ڕۆژگاری زانستی هەمەڕەنگە، دیارە ئەمەش لە گەلیك ڕووی جیهان زانست پەنگاوی داوە ، سەری وەك گژو گیای بەهاری کوردستان دەرهێناوە، ژیان بۆتە پیشەسازی ئامێری سەیرو سەمەرە، لەبازێڕ بەرچاو دەکەوێت ئۆتۆمبێلی نوێ و خێرا ڕەو ، تەلیفۆن و تەلەڤزیۆن و فاکس و سەتەلایت و ئەنتەرنێت بەڵام ئەمانە بەهۆی خودا پەرستیەوە نایەتە دەستت، بەڵکو بە هۆی دەوڵەمەندی ، کەواتە ئەمانە لەلای زۆربەی کەس دەست دەکەون ، کۆن دەبن ، تێك دەچن ساڵانێکی نزیکە، ئەم پیشەسازیە لەگەشەو پێشکەوتن دایە، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەر (ﷺ) ی سەروەر لەهەزارو چوار سەد ساڵ پترە، کەواتە تۆ ئەو ڕۆژە بێنە بەرچاوت کە ئەم پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ڕوداوەی گێڕایەوە لەناو کۆمەڵانێك کە زۆر نەفام بوون، هەتا خودی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : ((انا ابن امراة كانت تأكل القديد)) واتا : من کوڕی ئەو ژنەم کە نەیدەزانی گۆشت دەبێت بکوڵێت ئەمجا بخورێت، بەڵام ئەو گۆشتەکەی لەبەر خۆر وشك دەکردەوە، بەخاوی دەیخوارد، کەواتە ئەمە زانستی ئەو

کات بووە، بۆ نمونە چاپخانەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن ، سالأنێکی نزیکە داهێنراون، ئەو کەسەی کە بەهۆی شەوڕۆ پلەی (الصدیقی) وەرگرت (ابوبکری الصدیق) بوو بەتەنها، جگە لەهەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها (ابوبکری الصدیق) بووە خاوەنی ئەم سیفەتە، جگە لە پێغەمبەر محمد (ﷺ)یش هیچ پێغەمبەرێك گەشتی ئاوا دوورو درێژی نەکردووە (عیسا) پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر بێت، لەبەر ئەوەی خۆی بەرز کرایەوە، ئەگینا دەیانکوشت، پێغەمبەر (ﷺ) بەهۆی ئەم گەشتە بووە بەرنوێژی (امام) هەموو پێغەمبەرەکان.

گفتوگۆی دەگەڵ خودا کرد، هەروەك لەکاتی فەرموودەی نوێژ فەرز بوون، باسی لێوە دەکەم. کەواتە نیشانەی گەورێتی پێغەمبەر (ﷺ) لەهەمووکەسێك، فریشتەیەك، جنێك، هەموو بوونەوەرێکی خودا. بەرنوێژی کرد بۆ هەموو پێغەمبەرانی خودا، هەروا پەیامەکەی گشتیيە هەروەك خودا فەرمویەتی پێیان بڵێ: (إنـي رسـولُ الله إلـيكم جميعـاً) واتـا مـن پێغەمبـەری گـشتیم، کەواتـە پێغەمبـەرەکانی پـێش محمـد(ﷺ) هەموویان تایبەتی بوون، کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) دەبێ پەیوەندی دەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی سەر زەوی هەبێ، پێغەمبەری تری لەدوا نەیەت. هەر ئەو پێغەمبەرە، کەهەموو بانگدەرانی موسلمان و نوێژکەران ناوی دەگەڵ ناوی خودا دەبەن، چ قەلەمێك لەوزەی دایە پڕ پێستی سەر گوزشتەی زێڕینی بنووسێتەوە، ئەو پێغەمبەرە دەقە بەدەقە، کات بەکات، ڕۆژ بەڕۆژ، مانگ بەمانگ، ساڵ بەساڵ، تاتەمەنی ٦٣ساڵی هەمووی خێرو بێر بوو، هەمووی سەربەرزی بوو، لەماوەی ٢٣ساڵ هەر لەگەڵ قورئان ژیا، کەواتە تەمەنی ئەم پێغەمبەرە بۆیە خودا سوێندی پێ خواردووە! بێگومان وشەی (اسراء) واتا شەوڕۆ(ﷺ)ڕۆیشتنی شەو لە(کەعبەوە) تا (بيت المقدس) کەزانایانی ئیسلام دوو وەختیان بۆ نێوانی ئەم دوو شوێنە پیرۆزە داناوە، مانگە ڕێیەك و (٤٠) ڕۆژەرێ. بەهەر حاڵ نێوانی (مەککەو قودس) کاتێکی زۆری دەوێت، سەرباری هەموو ئاخافتنێك ئایەت دەرهەق ئەم ڕووداوە هاتووە، کەواتە نکوڵی کردنی شەوڕۆی پێغەمبەر (ﷺ) مرۆڤ (کافر) دەکات، بەڵام (معراج) واتا لە(بيت المقدس) ەوە بۆ

ئاسمانەکان و تەختی خوداو کورسی و (سدره المنتهی)، ئایەتی دەرهەق نەهاتووە، بەڵام زۆر فەرموودەی راست ودروست و جوان و (متواتر)ی لە بارەدا هاتووە. ئیدی لەم پێودانگەدا رۆن دەبێتەوە، هەردووکیان لەشەوێکدا روویانداوە، بەڵام پێشەوا (بوخاری) هەریەکەیانی لەباسێکی سەربەخۆ نوسیوە، تاگەیشتۆتە کاتی چۆنیەتی نوێژ فەرزبوون لەئەویێ هەردوکیانی بەیەکەوەناو هێناون، وشەی (اسراء) واتا شەورۆ، سورەتێکش لەقورئاندا بەناوی ئەم روداوە گرنگە ناوزەد کراوە، هەندێ لەزانایان لایان وایە، ئەم رووداوە دووجار کراوە جارێکیان لەکاتی خەوتن، جارەکەی تر لەکاتی بەخەبەری و بێداری، هەندێ لەزانایان لایان وایە ئەم رووداوە لەبەرواری ساڵێك بەر لەکۆچ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەمانگی ربیع الاول بووە، بەڵام قسەی بەناوبانگ بۆ بەرواری ئەوەیە کە لە(٢٧ رجب) بووە، وشەی (معراج) بە ژێری پیتی (میمە) لەعروج ە وە هاتووە، واتا بەرز بوونەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەزەمینەوە بۆ ئاسمانەکان لەکەمێکی شەو لەکاتی بەخەبەری، بە جەستەو رۆحی واتا رۆحی پێغەمبەر (ﷺ)، بێگومان خەونی پێغەمبەر (ﷺ) هەموویان راستن، بەڵام ئێمە کە شتێکی چاکترمان لابێت، بۆ شتێکی چاك بکەینە بەڵگە! کەواتە مادامەکی خودا فەرمویەتی ﴿ سبحان الذی اسری بعبده لیلا من المسجد الحرام الی المسجد الاقصی الذي بارکنا حوله لنریه من ایاتنا انه هو السمیع البصیر﴾ئەمە خۆی لەخۆیدا دەقێکی خودایی واتا دارە بۆ ئەم باسە، بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) زۆر دوژمنی سەر رەق و دڵ رەقی لەدەور بوو ، فرتێنەیان بۆ ئیسلام هەڵدەگیرساند، ئاگری گەورەیان دەکردەوە، شەیتانی بە نەفرەت دەرسی دەدان ، هەر رۆژەو نەخشەو پیلانێکی سەخت و کوشندەیان رێك دەخست، هەر لەبەر ئەوەی ئایینی خودا بەفووە گڵاوە کانیان بکوژێننەوە ، بەڵام ئەم هەموو پلانەیان ئەنجام و ئاکامی لەخانووی جاڵجاڵۆکە چاکتر نەبوو ، چونکە دژی خودا بوو، نەك ئەو کات ئێستاشی دەگەڵ دابێ ناحەز هەر هەبووەو هەیەو دەبێ، بەڵام ئەنجامی لەدوژمنە سەختەکانی پێغەمبەر (ﷺ) باشتر نابێ [٤٢] ئەوەتا ئەوەندەی (عوقبە)و (نضریی حارث) و (ولیدی موغەیرە) و (ئەبوجەهل) و (ئەبو موعەیەت) و (ابولهب) ئازاری

پێغەمبەر (ﷺ) یانـدا، بەڵام هیـچیان بە هیـچ نـەکرد، دەسـت و پەنجـەی پەشـیمانی دەگەزن، نەك هەر پێغەمبەر (ﷺ) بەتەنها بەڵکو ئەوەی بەدواشی بکەو تایە ئازاریان دەدا بۆ نمونە وەك : (ابو بکر)و (خباب) و ، (ابو فهیکە) و ، (عمار) (بلال)[٤٣].... تد ئەمانە ئازاری زۆریان چەشتوە لەپێناو ئایینی خودا ، سەیر ئەوەبوو بەهۆی هەر ئازارێك، ئەوانە گەرمو گوڕ تر دەبوون لەسەر یەکتاپەرستی، کاتێك (خەدیجە)ی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)و (ابو طالب) مەرگی خودایان بەجێ هێنا، پێغەمبەر (ﷺ) ساڵی مەرگیانی بەساڵی پەژارە ناو زەد کرد، بەڵام خودا بەهۆی شەوڕۆو بەرزبوونەوە دڵی پێغەمبەری ئەوەندە خۆش کرد کەناگوترێت، بێگومان دوژمنان ئەوەندەیان رق لە پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانی بوو راوێژیان دەگەڵ یەکتر کردو ئەم بەیان نامەیان لەدیواری (کەعبە) هەڵواسی: نابێ هیچ کەسێك دەگەڵ (محمد)و دارو دەستەکەی تێکەولێکە بکات، دەبێ هەموو لایەك نێوانی، دەگەڵی بچڕێنن ، ئیدی برای بەڕێز! ئایا ئەم هەواڵە ترسناك نییە کەوا دانانی ئابلوقەیە، نەمانی هاموشۆیە، بۆیە ناچار پێغەمبەر (ﷺ) بیری کردەوە، کەوا بەرەو (الطائف) بکەوتە رێ.

ئیدی کاتێ چووە (الطائف) بۆ ئەوەی بانگەوازی خودایان ئاراستە بکات، دەرماڵەی گیانو هەستیان لەپێغەمبەری خودا وەربگرن، ئەوان بەپێچەوانە جولانەوە، هەتا بگرە خوێن لەجەستەی پێغەمبەر (ﷺ) دەهاتە خوارەوە، لەسەر ئەم حالەش پێغەمبەر (ﷺ) بەزاری پیرۆزی دەستی بەنزاو پاڕانەوەو لاڵانەوە کرد لەخودای گەورە ئەمەش نزاکەی بوو:

((اللـهم اليكَ اشكُو ضعف قوتي وقلة حيلتي وهواني على الناس، يا أرحم الراحمين، انت رب المستضعفين وانت ربي الى من تكلني الى بعيد يتجهمني ام الى عدو ملكته امري، ان لم يكن بك علي غضب فلا ابالي، ولكن عافيتك اوسع لي اعوذ بنور وجهك الذي اشرقت له الظلمات وصلح عليه امر الدنيا والآخرة، من ان تنزل بي غضبك او يحل علي سخطك، لك العتبى حتى ترضى ولاحول ولاقوة إلا بك))[٤٤].

بێگومان بەبێ سێودوو لەم نزایە دەردەکەوێت، پێغەمبەر (ﷺ) لەئەو پەڕی

ناخۆشی دابووە.

شەوڕۆو چوونە ئاسمانی پێغەمبەر (ﷺ) بووە پلەیەکی بەرز بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ، بووە موعجیزە، بووە ڕێزێك بۆ ئاسمان و ئەوەی لەئاسماندایە، بووە شانازی بۆ موسلمانانی سەر زەوی .

کەواتە کافرەکان باهەرنامەردانە گەمارۆی ئابووری لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی دابنێن، ئەمە نابێتە کزی بۆ بانگەوازی خودا، چونکە ئەم ئایینەی خودا بۆ گەشەو نەشەڕەوانەی کردووە نەك کز بوون و نەمان.

خۆشەویستەکان ! نەکەن، چوونە ئاسمانی پێغەمبەر (ﷺ)و شەوڕۆکەی بەراورد بکەن، دەگەڵ تەلیفۆن و فاکس چونکە وەستان و شکانی ئەمانە شتێکی گونجاوە، هەروا ئەمانە تەنها توانای بردنی دەنگی مرۆڤەکانی سەرزەوییان هەیە نەك قسە کردن دەگەڵ خەڵکی ئاسمان، پێغەمبەر (ﷺ) لەهەمان کاتدا بەدەنگ و چاوو پێ و سەرجەمی ئەندامەکانی لەشی ئەم ڕێیە دوورەی بڕی، لەهەمان کاتدا هاتەوە. هێشتا ناو پێخەفەکەی گەرم بوو، سارد هەڵنەگەڕا بوو، دەرگەی ماڵەکەی هەرزیکەزیکی لێوە دەهات!. (سبحان الله).

## ڕاڤەی ئایەتەکەی شەوڕۆ

دەگێڕنەوە لە(ابن الجوزی) لەپێغەمبەریان پرسی؟ واتای (سبحان الله) چیيە ؟ گوتی پاك ڕاگرتنی خودا لەهەموو شتێ، بەڵام ئەم قسەیەی بەبێ پاڵپشت گێڕاوەتەوە.

زانایانی زمانی عەرەبی فەرموویانە: (سبحان) ناوی (عەلەمە) بۆ (تسبیح) وەك (سبحت الله تسبیحا) لێرەدا (تسبیح) چاوگەو (سبحان الله) ناوی عەلەمە بۆ ئەو.

واتای (سبحان الله) پاك و بێگەردی ڕاگرتنی خودایە لەهەموو خراپەیەك.

واتای (سبحان) لەزمانەوانیدا دوور نیە واتا دوور ڕاگرتنی خودا لەهەموو

خراپەیەك ، بزانە، خودای گەورە دەربارەی شەوڕۆی پێغمبەری سەروەر بە وشەی سبحان دەستی پێکردووە، بەڵام دەربارەی دابەزینی قورئانی پیرۆز بە (الحمد لله) دەستی پێکردووە.

وشەی (سبحان) بۆیە (منصوبة) کارێکی شارەوەی پێەوەیە، لەتەقدیردا بەم شێوەیە : سبحان الله سبحان، بۆیە لەمەوبەر گوتم (سبحان) بۆ دووری هاتووە، ئەم ئایەتە بۆتە بەڵگە لەسەری ﴿ إن لك في النهار سبحاً طويلا﴾ أی تباعدا.بۆ زۆر واتای تر هاتووە بۆ نمونە (فلولا انه كان من المسبحين) بەواتای نوێژ هاتووە لەم ئایەتە.

وشەی (سبحان) بۆ تەعجوبە: جابەڕاستی روداوی شەوڕۆو چوونە ئاسمان جێی سەرسام بوونو تەعەجوبن، ئەویش وشەی ناسكو نازداری (اسری بعبده)یە لەنێو عەرەبەکان وشەی (اسری و سری) بۆ شەو ڕۆ بەکار هاتووە، بەڵام دەقی قورئانی پیرۆز لەم شوێنە وشەی (اسری)ی بەکار هێناوە، دیارە ئەمەش کێشەی زانایانی لەسەر نییە. بۆ خودا فەرموویە (اسری بعبده) نەیفەرمووە (اسری بنبیە)؟ (٤٥). چونکە بەندایەتی لەبەندەوە بۆ خوداوەیە، بەڵام پێغەمبەرایەتی لەخوداوە بۆ بەندەیە. کەواتە لەم پێودانگە ئاشکرا دەبێت کەوشەی (عبد) وشەیەکی گەورەیە ، دیارە ئەگەر بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وشەیەکی چاکتر هەبوایە، خودا ئەوی بەکار دەهێنا، بەڵام لەم وشەیە چاکتر نییە، هەروا وشەی (عبد) واتای مرۆڤێکی بەرۆحو جەستە نیشان دەدات نەك بەتەنها بە رۆح. ئەگەر مەبەست لە(عبد) رۆح بوایە بەتەنها، (بوراق) بۆچی دەهات؟ چونکە بۆراق شت هەڵدەگرێت.

هەموو زانایانی ئیسلام یەکدەنگن کەوشەی (اسری بعبده) مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ)ە .

دەگێڕنەوە لە (سليمان الانصاری) گوتی: کاتێ خودا پلەی شەوڕۆو چوونە ئاسمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) بەخشی، پەیامی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانە کرد، ئەی (محمد) چۆن ڕێزت لێ بگرم؟ پێغەمبەر (ﷺ) لەوەرامدا گوتی: ئەی خودایە! ناوم

ببە بەبەندەی خۆت (بأن تنسبني الى نفسك بالعبودية) ئەوە بوو دواتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. (قشيرى) دەڵێ بۆیە خودا ناوی بەندەی هێناوە، تا بەهۆی ئەمە ببێتە مل کەچی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نەك خۆهەلدانەوە ! (قتادە) دەڵێ : کاتێ خودا (عیسا) پێغەمبەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە چوار زانای دیانەکان بووە دەمەقاڵیان یەکەمیان گوتی : ئەمە خودا بوو هاتە سەرزەوی شتەکانی دروست کرد گەڕاوە ئاسمان، کۆمەڵێك دیان بەدوای ئەم پیاوە کەوتن، بەڵام سێ زاناکەی تر بەدرۆیان خستەوە زانای دووهەم گوتی : خوداو عیسا پێغەمبەر و مەریەمی دایکی هەرسێکیان خودان . کۆمەڵە دیانێکی تر بەدوای ئەمە کەوتن، بەڵام دوو زاناکە باوەڕیان پێ نەکرد. زانای سێهەم گوتی : عیسا کوڕی خودایە، کۆمەڵە دیانێکی تر بەدوای ئەمە کەوتن، بەڵام زانای چوارەم باوەڕی پێ نەکرد. زانای چوارەم گوتی : قسەی هەرسێکتان هەڵەیە، عیسا بەندەی خودایە، چونکە دەخوات، دەخەوێت ئەم سیفەتانە لەخودا نیە، ئیدی قسەی زانای چوارەم لەهەموویان ڕاسترو چاکتر بوو .

بزانە زۆربەی زۆری کارەگرنگەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەشەوو ڕۆژی دووشەممە بووە ئەوەتا لەمێژووی زێڕینی ئیسلام ئەمانەی خوارەوە تۆمار کراون:

پێغەمبەری سەروەر لەڕۆژی دووشەممە لەدایك بووە، بۆتە پێغەمبەر،چۆتە مەدینە، لەمەککە دەرچوەو، شەوڕۆی پێکراوەو هەر لەڕۆژی دووشەممەش، مەرگی خوای بەجێهێناوە.

وشەی (لیلا) واتا کەمێك لەشەو، شەوەکەش شەوی دووشەممە بووە، بەنسبەت تەقویمی کۆچی بەرواری رۆژو مانگ و ساڵ لەکاتی خۆر ئاوابوون حوکمی پێدەکرێ، بەڵام بەنسبەت ساڵنامەی زایینی لەنیوەی شەو بەرواری ڕۆژو مانگ و ساڵ دەست پێدەکات. ئیدی ئەو شەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) شەوڕۆی تیادا کرد شەوی دووشەممە بوو لە(٢٧ی مانگی رجب).

لە(تەفسیری الکبیر) هاتووە کەنێوانی کەعبەو قودس (٤٠ڕۆژە) ڕێیە، بەڵام

(تەفسیری الخازن و المدارك) ئاماژەی کردووە کەوا نێوانی کەعبەو بیت المقدس (۳۰ڕۆژە) ڕێیە. جا پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ماوەیە درێژەو چوونە ئاسمانیشی دەگەڵ دابێ بەهەندێکی لەشەو بڕیوەو هاتۆتەوە سەر پێخەفەکەی.ئەم گەشتە دوورو درێژەی پێغەمبەر (ﷺ) بەهۆی بۆراق بووە، (البیهقی) لەبارەی بۆراق فەرموویە: بۆراقیش گیاندارێکە لە گوێدرێژ گەورەترە، لەهێستر بچوکترە.

پێغەمبەرەکانی خودا هەموویان سواری پشتی ئەم گیاندارە بوونە، هەروەك پێغەمبەریش سواری پشتی بوو لەشەوڕۆ. (ابن اسحاق) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) وەسفی بۆراقی دەکرد گوتی: هەرگیز شتێکی وەك بۆراقم نەدیوە لەجوانیدا (یمد إلیه المیت عینه إذا احتضر) نەخۆشی سەرەمەرگ چاوی پێبکەوێت سەیری دەکات[٤٦].

ئەو گیاندارەش ئەوەندە خێرا بوو لەکاتی ڕۆیشتن ئەگەر پێی لەو شوێنە دادەناکە دوا جێ بوو چاوەکانی دیبووی ، (ابن سعد) لە (واقدی) دەگێڕتەوە کە بۆراق دوو باڵی هەبووە فڕیوە، کەچی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) وا هەیە، نیشان دەدات کە نەفڕیوە، بەهەر حاڵ پێناسەی شەوڕۆو بۆراق شتێکی ئاسان نییە. ئیدی یەکەمین گەشتی پێغەمبەر (ﷺ) لەکەعبەوە دەستی پێکرد هەرچەند پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵی (امهانيء) بوو، کە دەکاتە کچی (ابو طالب)، بەڵام حەرەمی (کەعبە) هەر هەمووی بەمزگەوت لەقەلەم دەدرێت[٤٧].

## من المسجد الحرام

واتا: یەکەمین شوێنی دەست پێکردنی گەشتی پڕ خێرو بێری (محمد) پێغەمبەر (ﷺ) لەمزگەوتی (الحرام) دەستی پێکرد، بێگومان شاری مەککە ئەو شارەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) تیایدا لەدایك بووە، ئەو شارەیە کەخودای شکۆمەند بەشاری ئەمین و ئاسایش ناوزەدی کردووە وەك فەرموویەتی: ﴿ وهذا البلد الأمين

﴾، ئەو شارەیە کەدەبێت هەموو موسڵمانێك ئەگەر توانای هەبوو لەماڵو لەڕێ‌و بان، لەتەمەنی ژیانییدا پێویستە جارێك سەردانی ئەم شارە بکات، تا پلەی حاجی وەربگرێت، ئەگینا لەڕۆژی دوایدا شەرمەزار وبەشیمان دەبێت، شاری (مەککە) سەرکردەی هەموو شارەکانی ئیسلامە، شاری (مەککە) پایتەختی ئیسلامە، شاری (مەککە) لەپێش ئیسلامیشدا شارێکی بازرگانی بووە، شاری مەککە شاری سەرهەڵدانی ئیسلامە، شاری مزگەوتی الحرام، بیری زەمزم، مقامی ابراهیم پێغەمبەر (ﷺ)ە شاری مەککە شاری الحجر الاسود -بەردە ڕەشەکە-یە، شاری مەککە زۆر ناوی تری هەیە، ناوی زۆریش بەڵگەیە لەسەر گەورێتی شاری، ناوبراو ، بێگومان ئەم شارە بەناوی بیت ەوە ناسراوە هەروەك خودا فەرفوویەتی:﴿ جعل الله الكعبة البيت الحرام ﴾ هەروا بەکەعبە ناسراوە، هەروەك لەهەمان ئایەت هاتووە، هەتا پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی کە (کعبە) ڕێزی زۆری لێدەگیرا سوێندیان پێ دەخوارد، بۆیە قەدەغەی کردن لەسوێند خواردن بەکەعبە، فەرمووی ئەگەر هەر ناتوانن، بڵێن و(رب الكعبه) واتا بەخودای کەعبە. ناوی بە (بكة) هاتووە هەروەك خودا فەرمویەتی: ﴿ ان اول بيت وضع للناس لَلَّذي بِبَكة مباركا ﴾ هیچ شارێك نییە لەسەر ئەم زەمینە وەك شاری مەککە ، یەکەمین مزگەوتی سەر زەوی لەئەوێدا دروست کراوە.

سیفەتی ئەم شارە بە ئەمین ناوزەدکراوە (وهذا البلد الامين) هەروا زۆربەی موسڵمانان لەکاتی ناو هێنانی دەڵێن (مكة المكرمة) .

کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) لەم شارە پیرۆزە وە بۆ (قودس) بوو، لەقودسیش بۆ ئاسمانەکان – گەڕانەوەشی بۆ هەواری جاران بوو واتا (مکە) .

شاری مکە شاری ڕووگەی باوەڕدارانە هەروەك خودا فەرموویەتی: ﴿ فولوا وجوهكم شطر المسجد الحرام ﴾ ئەم شارە ٤٠ ساڵ لەپێش قودس دامەزراوە واتا(مزگەوتەکەی)، بێگومان پێغەمبەری سەروەرمان لەزۆر فەرمووده ناوی مەککەو

ولاّتی (حیجازی) هێناوه[٤٨] .

عن جابر ان رسول الله (ﷺ) قال: غلظ القلوب والجفاء في المشرق، والإيمان في اهل الحجاز .م. واتا: دڵرەقیو بێ ویلی لەناو خەڵکی رۆژ هەلاّتدا باوە، باوەڕیش لەنێو خەڵکی حیجازدا باوە. خوێنەری بەڕێزا شاری مەککە شاری روگەی موسلمانانە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من صلى صلاتنا واستقبل قبلتنا واكل ذبيحتنا فذلك المسلم الذي ذمّة الله وذمة رسوله فلا تخفرو الله في ذمته) . رواه:ب.ن.

واتا: هەرکەسێك نوێژەکەی وەك نوێژی ئێمە بێ، روو لەڕوگەی ئێمە بکاتن، ئەوەی ڕەواکراوە لەسەر بڕاوەکان بیخوات، ئەوە لەئامانی خوداو پێغەمبەر (ﷺ) دایە، بەموسلمان لەقەلەم دەدرێت، کەوا بوو ئێوەش ئامانو پەیمانی خودا ببەنە سەرو ناپاکی لەو موسلمانانە مەکەن. بەلێ کەعبە هەمیشە روگەی موسلمانان نەبووە، تا ماوەی شانزە هەڤدە مانگ پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەلاّن روگەیان قودس بوو، بەلاّم پێغەمبەر (ﷺ) زۆری حەز لەوەبوو  رووی بکاتە کەعبە، هەروەك پێشەوا (بوخاری)و (ترمذي) گێڕاویانەوە:

(كان رسول يحب ان توجه للكعبة فأنزل الله (قد نرى تقلب وجهك) واتا : ئەی محمد ئێمە ئاگادارین کەوا تۆ بەدەست نزاوپاڕانەوە، روو لەئاسمان دەکەی چاوەڕێی ئەوەیت روگەت ببێتە کەعبە، (فلنولينك قبلة ترضاها فول وجهك شطر المسجد الحرام وحيث ماكنتم فولو وجوهكم شطره) ، (فتوجه نحو الكعبة). دڵنیابە روگەت بۆ دەگۆڕین لەقودسەوە بۆ کەعبە، ئیدی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) نەك هەر تۆ بەڵکو ئەوەی شایەدی بە تۆ هێناوە دەبێ روو بکاتە روگە ، کەواتە کاکڵەی مەبەستی سەرەکی ئەم فەرموودانە ئەوەیە کەعبە روگەیە، ئیدی ئەوەندەی پێغەمبەر (ﷺ) رووی کردە (بيت المقدس) واتا (١٦-١٧) مانگ لەکانگەی دڵیەوە هەر حەزی لەوە بوو خودا، دەقی ئاسمان لەسەر رووکردنە رووگە ڕەوانە بکات، هەروا حەزی پڕاوپڕی ئەوەبوو کەخودا کەعبە بکاتە رووگەی خۆی و ئومەتەکەی،

ئەوە بوو خودا بەمەرامی گەیاند[٤٩].

بزانە پێشەوا (عمر)یش زۆر حەزی لەوە بوو کە کەعبە رووگە بێ، خوێنەری هێژا شاری مەککە پڕە لەشوێنی پیرۆزی پەسند کراو لەلایەن خودای گەورە.

رووڵەهەر لایەکی (المسجد الحرام) دەکەی شوێنی خودا پەرستییە، جێی پێی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانە، گۆڕی شەهیدانی ئیسلامە، شەهیدانیش هەمیشە زیندوونە، شوێنی دابەزینی جبریل و فریشتەکانە، شوێنی دابەزینی پەیامی خودایە. هەموو ساڵێك ئەم شارە ملیۆنەها کەس بەیەك دەنگ و ڕەنگ و مەبەست، تیادا لەبەر خودای گەورە دەپاڕێنەوە، سەردانی یەك بارەو دووبارەو دەیاها بارە بۆ ئەم شارە دەکەن.

برایەتی باوەڕیان گەشەو نەشە دەکات، ڕەگی دۆستایەتی دادەکوتن ، لەهەمووی خۆشتر وەك منالی ساوایان لێ دێت، خودا لەتاوان و خراپە پاکیان دەکاتەوە، کەواتە ئەم شارە شاری پاکژ بوونەوەیە لەخراپە، کێوی (عەرەفە) لەنزیك ئەم شارەیە، پێویستە حاجی لەبەرواری (٩ذي الحجة) بچێتە ئەم کێوەو لەسەری ڕابوەستێ هەروا هاتوچۆ بکات لەنێوانی (سەفاومەروە) هەروەك خودا فەرموویەتی ﴿ إن الصفا والمروة من شعائر الله ﴾ هاجەرەی دایکی اسماعیل پێغەمبەر لەم شوێنە بەدوای ئاودا دەگەڕا.

هەروا (عەقەبە) شوێنێکە لەنێوان (مناو مەککە) حاجیەکان لەئەوێ شەیتان بەردەباران دەکەن هەروا (ابو القبیس) شاخێکە لەنزکترین شاخەکانی مەککە، بیری (زەمزەمیش) بیرێکە (٢٤) مەتر قوڵە، ئاوەکەی تفەڕکە چونکە لەئەو کاتەی کە(هاجەرە)و (اسماعیلی) کوری لەئەم شوێنە بارگەیان دانا ئاوی لێ نەبوو، جا(جبریل) ئەم بیرەی بۆ هەڵکەندن.

خوێنەری هێژا، ڕوداوی موعجیزەی شەوڕۆی پێغەمبەر (ﷺ) لەشەوی دووشەممەی (٢٧ی مانگی ڕەجەب) لەساڵی (یانزەهەمی) پێغەمبەرایەتی بوو، واتا

نزیکەی دوو ساڵ لەپێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچ بکا بۆ مەدینە. پێغەمبەری سەروەر لەماڵی (هند)ی کچی (ابوطالبی) مامی بوو کە (هند) بە (امهانيء) ناسراوە. ماڵی (هند) لەناو حەرەمی (کەعبە) بوو. حەرەمی کەعبە هەرهەمووی بەمزگەوت لەقەلەم دەدرێت .

(ام هانيء) گوتی: نوێژی خەوتنانمان کرد، لەپاشان خەوتین بۆ نوێژی بەیانی هەمان شەو پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردین گوتی: بەیانییە! ئێمەش هەڵساین و نوێژی بەیانیمان دەگەڵ کرد. ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) بە (ام هانيء) ی گوت: دەزانی من ئەمشەو چوومەتە (بيت المقدس) لەوێش نوێژم کردووە، (ام هانيء) دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەم قسەیە لای کەس مەدرکێنە باوەڕت پێ ناکەن ، پێغەمبەر (ﷺ) بە(ام هانيء)ی گوت: سوێند بەخودا بۆیان دەگێڕمەوە.

خوێنەری خۆشەویست! ئاشکرایە دەقی خودای گەورە بەڵگەی هەستونەستی پێناوێت، خودا خاوەنی دەسەلاتە (وهو علی کل شیءقدیر). جائەگەر خوانەخواستە باوەڕت بەشەورۆی نەبێت ئەوە کافر دەبیت، کەواتە ئەگەر بێتوڕامێنێی لەنێوانی کەعبەوقودس کە (٢٥٠٠کم) دەقی قورئانی لەسەر هاتووە ئەوا (معراجیش) بە هەمان چەشن فەرموودەی راستودروستی لەسەر هاتووە کەواتە یەکێکی وەك (بوخاری) و(مسلم) و زۆر لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ) باس لەچونە ئاسمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی رأيت ليله أسري بي واتا لەو شەوەی چوومە ئاسمانی ئەمەو ئەوەم دیت، دیارە هاوەڵان بەبێ سێودوو ئەم ڕوداوەیان لەلاسەیر نەبووە،لەهەمان کاتا ئەوانەی لەلایان سەیر بوو کافربوونە .خوێنەری هێژا : شەوڕۆو بەرز بوونەوەی پێغەمبەری سەروەر چوار خاڵی بەخۆیەوە گرتووە :

(١) لە رووی ڕامیاریەوە: ئاشکرایە بەهۆی ئەم گەشتە پڕ لەخێرو بێرەوە ئەو سوودەی هۆدەی بە پێغەمبەر گەیاند، کە پلەی بەرنوێژی بوو بۆ سەر جەم پێغەمبەرانی خوداو (جبریلیش) نوێژەکەی دابەستا.کەواتە پێغەمبەران هەموویان خۆشەویستن بانگەوازی هەموویان بۆ وشەی (لااله الاالله)یە، جیاوازی لەنێوان

پێغەمبەران نیە، بەڵام هەندێکی تر پلەیان بەرزترە بۆ نمونە پێغەمبەرە (اولو العزم)ەکان واتا خاوەن نیازو تواناکان، ئەمانەن نوح،ابراهیم،موسى،عیسى،محمد لەنێوان ئەمانەشدا محمد لەهەموویان گەورەترە .

(٢) لەرووی کۆمەڵایەتی: ئەوشوێنانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) گەشتی تیایاندا کرد، هیچ کامیان خاکی عەرەب نشین نەبوون کەواتە ئەم گەشتەی پێغەمبەر (ﷺ) گەشتی مرۆڤایەتی بوو نەك نەتەوایەتی.

(٣) لەڕووی بیرباوەڕ: ئەم گەشتەی پێغەمبەر (ﷺ) بووە هۆی چەسپاندنی دڵی هەندێ باوەڕدارو،هەڵگەڕانەوەی گوماندارو دودڵەکان و کەواتە بەهۆی ئەم گەشتە ڕەشوسپی دەرکەوتن.

(٤) لەڕووی گیانی: ئەم گەشتەبووە هۆی دامرکاندنی دڵی پێغەمبەری سەروەر، زۆرتربوونی ورەی بەخوداو دڵخۆش بوونی، لەپاش ئەوەی ساڵی مەرگی خدیجەو مامی خۆی بەساڵی پەژارە ناوزەد کرد، بەساڵی (عام الحزن) ناسراوە لەلایەن دیرۆکزانان.

**دەربارەی شەوڕۆوبەرز بوونەوەی پێغەمبەری سەروەر خەڵك بیروباوەڕی هەمە ڕەنگیان هەیە سەرجەم بیرو باوەڕەکان لەئەمانەی خوارەوە خۆیان دەبینن.**

(١) هەندێك باوەڕ بەهەردووکیان دەکەن واتا: شەوڕۆ کەدەقی قورئانی لەسەرهاتووە، دووهەم بەرزبوونەوە کەدەقی فەرموودەی ڕاست و دروستی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر هاتووە.

(٢) هەندێك هەردووکیان بەدرۆ دەخەنەوە ئەمەش دیارە کەنکۆڵی کردنی شەوڕۆ دەبێتە کافربوون،بەڵام نکۆڵی کردنی بەرزبوونەوە تاوانێکی گەورەیە.

(٣) دەستەی سێهەم باوەڕ بە شەوڕۆ دەکەن،بەڵام باوەڕبە بەرزبونەوە ناکەن.

(٤) دەستەی چوارهەم باوەڕیان وایە کە شەوڕۆوبەرزبوونەوەو بە جەستەو گیانی

پێغەمبەر بووە ئەمەش باوەڕێکی چاکە .

(٥) شەوڕۆوبەرزبوونەوە تەنها بەرۆحی پێغەمبەربووە، ئەم ڕایە پێچەوانەی بوونی موعجیزەی پێغەمبەرایەتیە.

(٦) هەردووکیان بە خەون بووە ئەمە ڕایەکی خراپە.چونکە ئەگەر بە خەون بێت بۆراق بۆچی بێت.ئەگەر بێت و سەرنج بدەینە دەقی ئەم تاقە ئایەتە دوو موعجیزەمان دەست دەکەوێت، ئەویش موعجیزەی من المسجدالحرام–و– الى المسجد الاقصى–یە–کەچی لەو کاتە ئەم دوو شوێنە مزگەوت نەبوون، بانگەوازی ئیسلامەتیان تیادانەبووە، وەك بانگ دان و نوێژکردن وقورئان خوێندن، بەلاّم ئەوەبوو لەپاش فەتحی مکە کەعبە بووە مزگەوتێکی ئیسلام بۆ یەکەم جار (بلال) بانگی ئیسلامی لێدا ئیدی هاوەلاّن بەهۆی ئەم موژدە زۆر دڵخۆش بوون[٥٠]. قودسیش لەساڵی ١٧ی کۆچی لەسەر دەستی أباعبیدة الجراح.

## (الى المسجد الأقصى)

(الى المسجد الأقصى) واتا پێغەمبەر (ﷺ) لەمزگەوتی (الحرام) هاتە مزگەوتی (الأقصى) واتا (بیت المقدس)، بیت المقدسیش واتا إلیا+ بیت الله. ماڵی خودا.

مێژووی پیرۆزو زێڕینی (بیت المقدس) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (داود) پێغەمبەر لەڕاستیدا لەسەردەمی (داود) مزگەوتی (قودس) تەواو نەبوو، (الطبري) فەرموویەتی: داود پێغەمبەر نیازی دامەزراندنی هەبوو، خودا پەیامی بۆ ڕەوانە کرد (إنما یبنیە ابن لك طاهر الید من الدماء)، واتا ئەی داود پێغەمبەر! کوڕێکت پێدەبەخشم پاکژەو دەست پاکەو خوێنرێژ نییە، ئەو مزگەوتی قودس دادەمەزرێنێ.

لەفەرمودەی ڕاست و دروستی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە، (بیت المقدس) بە٤٠ساڵ لەپاش کەعبەی پیرۆز بنیات نراوە، ئەوەش بەڵگەیە کەئەم (بیت المقدسە) لەسەردەمی (اسحاق) پێغەمبەرو (یعقوب) پێغەمبەر هەبووە ، بەڵام کۆتایی بەتەواو بوونی نەهاتبوو لەسەردەمی (سلێمان) پێغەمبەر تەواو بوو دەستی لێبڕا.

خودا فەرموویەتی (المسجد الأقصی) واتا مزگەوتە دوورەکەی لەمەککە کە قودسە. چونکە لەنێوان (مەککەو قودس) هیچ مزگەوتێکی تر نەبووە نێوانی ئەم دوو مزگەوتەش (٢٥٠٠کم) بووە، شاری قودس شارێکە خودا بەپیرۆز ناوزەدی کردووە چونکە لەقورئانی پیرۆز چوار شوێن ناویان بەپیرۆز هاتووە ئەوانیش مەککە، مەدینە، قودس، کوردستان.

یەکێك لەپادشایانی دیانەکان کەناوی (تەتیۆس) بوو شاری قودسی تەفرو تونا کرد، تەوراتی پیرۆزی سوتاند نامەیەکی ئاسمانی بوو، خودا بۆ موسی پێغەمبەری ڕەوانە کرد بوو، خەڵکی قودسی کوشت ئەم شارەی پڕ لەبەرازی کەلاکی گەندە کرد، بەرازی تیادا سەر بڕی.

ئەم شارە چۆڵو هۆل بوو تالە سەردەمی (عمری کوڕی خطاب ) دووەمین جێنشی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم شارەی ڕزگار کرد. ئەمجا سێ بارە فەڕەنگیەکان ئەم شارەیان کەوتە دەست، تاماوەی سەد ساڵ لەژێر ڕکێفی ئەواندا بوو.

ئەمجارەیان لەسەردەمی زێڕینی (صلاح الدین الایوبی) کەپادشایەکی قارەمانی موسلمانی ڕەگەز کورد بوو ، لەساڵی (٥٨٥) کۆچی ئازادی کرد[٥١].

(روی الامام الترمذی عن جبیر بن نفیر عن شداد بن اوس قال : قلنا یا رسول الله کیف اسری بك قال : صلیت لاصحابی صلاة العتمة بمکة معتما، فاتانی جبریل بدابة أبیض او قال بیضاء فوق الحمار ودون البغل، فقال ارکب فاستصعب علی فرازها بأذنها ثم حملني علیها فانطلقت تهوی بنا یقع حافرها حیث انتهی طرفها

حتى بلغنا ارضا ذات نخل، فأنزلني فقال: صل، فصليت ثم ركبتُ فقال أتدري اين صليت فقلت الله اعلم قال صليت بيثرب، صليت بطيبة، فانطلقت تهوى بنا يقع حافرها عند منتهى طرفها ثم بلغنا ارضا قال انزل، ثم قال صل فصليت ثم ركبنا فقال بمدين عند شجرة موسى ثم انطلقت تهوى بنا يقع حافرها حيث ادرك طرفها ثم بلغنا ارضا بدن لنا قصور فقال انزل فنزلت فقال صل فصليت ثم ركبنا فقال اتدري اين صليت قلت الله اعلم قال صليت ببيت لحم، حيث ولد عيسى ابن مريم ثم انطلق حتى دخلنا المدينة من بابها اليماني فأتى قبلة المسجد فربط فيه دابته ودخلنا المسجد من باب تميل فيه الشمس والقمر فصليت من المسجد حيث شاء الله واخذني من العطش اشد ما اخذني، فأتيت بأناءين في احدهما لبن وفي اخر عسل ارسل إلى بهما جميعا فعدلت بينهما ثم هداني الله عزوجل فأخذت اللبن، فشربت حتى عرقت به جبيني وبين يدي شيخ متكيء على مثواب له فقال اخذ صاحبك الفطرة انه ليهدى، ثم انطلق بي حتى اتينا الوادي الذي فيه المدينة فإذا جهنم تنكشف عن مثل الروابي قلت يارسول الله كيف وجدتها مثل الحمة السنخة، ثم انصرف بي فمررنا ببعير لقريش بمكان كذا وكذا قد اضلوا بعيرا لهم قد جمعه فدنوتُ فسلمت عليهم، فقال بعضهم هذا صوت محمد ثم اتيت اصحابي قبل الصبح بمكة فأتاني ابوبكر رضي الله عنه فقال، يارسول الله اين كنت الليلة فقد التمستك في منامك فقد علمت انك اتيت بيت المقدس الليلة، فقال رسول الله انه مسيرة شهر فصفه لي، قال ففتح لي صراط كأني انظر إليه لايسألني عن شيء إلا انبأته فقال ابوبكر اشهد انك رسول الله وقال المشركون انظروا الى ابن كبشة يزعم انه اتى بيت المقدس الليلة ، قال: فقال ان من اية ماقول لكم اني مررت بعير لكم في مكان كذا وكذا وقد اضلوا بعيرا لهم فجمعه لهم فلان وان مسيرهم ينزلون بكذا ثم بكذا ويأتونكم يوم كذا وكذا يقدمهم جمل ادم عليه مسيح اسود وغرارتان سودان فلما كان ذلك اليوم اشرف الناس ينظرون حيث كان قريبا من نصف النهار حتى اقبلت

العير يقدمهم ذلك الجمل الذي وصفه رسول الله. رواه الترمذي، البيهقي وقال اسناده صحيح، قال ابن كثير وهذا الحديث مشتمل على ماهو الصحيح كما قال البيهقي وعلى ماهو منكر كالصلاة في بيت المقدس وسؤال الصديق عن نعت بيت المقدس[٥٢].

هاوەڵان لەپێغەمبەریان پرسی چۆن شەوڕۆت پێکرا؟ پێغەمبەر (ﷺ) یش لەوەرامیاندا گوتی: من نوێژی شێوانم کرد بۆ هاوەڵان لەشاری مەککە دواتر جبریل هاتە لام و گیاندارێکی لابوو ڕەنگی سپی بوو، لەگوێدرێژ گەورەتر بوو، لەهێستر بچوکتر بوو، پێی گوتم سواربە، جامنیش سواری پشتی بووم، ئەوەندە خێرا بوو پێیەکانی لەئەو شوێنە دادەنا کە چاوەکانی دەی دیت، تاگەیشتینە شوێنێك کەپڕ بوو لەدارخورما دایبەزاندم و گوتی: نوێژ بکە، منیش نوێژم کرد، ئینجا سواری پشتی بووم و گوتی: دەزانی لەکوێ نوێژت کرد؟ گوتم: خودا دەزانێ، گوتی: ئەمە (یثرب بوو واتا شاری مەدینەی پاك).

ئەو جارەیان وەك جاری پێشوو خێرا ڕۆیشت تا گەیشتینە شوێنێك گوتی: دابەزە منیش دابەزیم، گوتی: نوێژ بکە، نوێژم کرد، گوتی: دەزانی لەکوێ نوێژت کرد؟ ئەمە مەدیەن بوو، ئەو درەختەی کەخودا لەئەوێ قسەی دەگەڵ موسی کرد. ئەو جارەیان وەك جاری یەکەم و دووهەم خێرا ڕۆیشت، تاگەیشتووینە شوێنێ گوتی: دابەزە، منیش دابەزیم، گوتی: دەزانی لەکوێ نوێژت کرد؟ گوتم خودا دەزانێ، گوتی: ئەمە (بیت لحم) بوو، شوێنی لەدایك بوونی عیسا پێغەمبەر، ئەو جارەیان وەك جاری یەکەم و دووهەم و سێهەم خێرا ڕۆیشت، ئەو بۆراقە ئەوەندە خێرا ڕەو بوو چاوی تاکوێ بدیبایە پای لەئەوێ دادەنا، جا لەدەرگەی لای ڕاستەی مزگەوتەکە بۆراقی بەستایەوە. ئێمەش چووینە ناو مزگەوت لەئەو دەرگەی کەبەلای خۆرو مانگەوەبوو، نوێژمان کرد ئەوەندەی خودا حەزی کرد زۆرم تێنو، بوو، دوو

پەرداخیان بۆم هێنا، یەکێك هەنگوینی تیادا بوو، یەکێك شیر، منیش دڵم بۆ شیرەکە چوو خواردمەوە، نیوچەوانم ئارەقەی کرد، پیاوێکی پیر چەمابۆوە گوتی: بەڕاستی بەهۆی ئەم شیر خوادنەوەیە محمد (فطرتی) هەڵبژارد، ئینجا لەئەوێ ڕۆیشتین تووشی شیوێك بووین، دۆزەخ لێمانەوە بەدەرکەوت. ئینجا لەکاتی گەڕانەوەم بەلای کاروانێکی قوڕەیش تێپەڕیم لەفیسار شوێنو فیسکە شوێن، وشترێکیان لێ بزر ببوو، سلاوم لێکردن وەرامیان دامەوە لەنێوخۆیاندا گوتیان: ئەمە دەنگی (محمد) بوو، لەپێش بەیانی گەڕامەوە مەککە، (ابوبکر) هاتە لامو گوتی: ئەمشەو لەکوێ بویت؟ من ئیمشەو تۆم لەخەودا دیت لە (بیت المقدس) بوویت، ئەمە مانگە ڕێیەکە پێناسەم بۆ بکە.

مامۆستا البغوی دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەشەوی شەوڕۆکەیدا گەڕایەوە لەدۆڵی الطوی بەجبریلی گوت: ئەگەر ئەم ڕووداوە بۆ گەلەکەم بگێڕمەوە باوەڕم پێناکەن؟ جبریل گوتی: ابوبکر باوەڕت پێدەکات، هەربۆیەش سیفەتی الصدیقی پێبەخشرا لەلای خوداو پێغەمبەر (ﷺ) ، عبدالله عباسو عائشە فەرموویانە: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) چووە بیت المقدسو ئاسمان لەگەڕانەوەیدا زۆر دڵ تەنگ بوو، خەمی ئەوەی هەبوو کەباوەڕی پێنەکەن، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: بەکزو مەلولی و پەژارە دانیشتم ابوجهل هاتە لامو وتی ئیمڕۆ چیت پێیە بەگاڵتە وای بە پێغەمبەر (ﷺ) گوت، پێغەمبەریش گوتی ئیمشەو چوومەتە (بیت المقدس)، (ابوجهل) گوتی لەپاشان هاتیەوە پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: بەڵێ، ئیدی ابوجهل تاماوەیەك بزر بوو، دوایی لەگەڵ هەندێ کافر هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) تومەز نیازی ئەوەی هەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) لەپێش چاوی کافرەکان ریسوا بکات! بۆیە رووی لەپێغەمبەر کردەوەو پرسیارەکەی لە پێغەمبەر (ﷺ) کردەوە گوتی: ئیمشەو لەکوێ بوویت پێغەمبەریش گوتی لەبیت المقدس ، هەندێك لەکافرەکان چاك شارەزای بیت المقدس بوون" ئیدی دەستیان بە پێکەنین کرد، ئەوانی تریش دەستیان لەسەر

سەری خۆیان دانا، واتا قسەکەی پێغەمبەر (ﷺ) درۆیە، بۆیە زۆر لەموسڵمانەکانیش بەهۆی ئەم قسەیە لەئایین هەڵگەڕانەوە، ئیدی یەکێك لەکافرەکان چووە لای ابوبکرو گوتی محمد دەڵێت ئەمشەو چوومەتە بیت المقدس و گەڕاومەتەوە ابوبکر گوتی: محمد ڕاست دەکات ئەگەر لەئەمەش گەورەتر بلێت هەر ڕاست دەکات. ئیدی بەم بۆنەیە ابوبکر ناوی نرا الصدیق کە هیچ هاوەڵێکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ناوەی نییە. ئیدی ئەوانەی کە بیت المقدسیان پێشتر دیبوو گوتیان: باسی قودسمان بۆ بکە، پێغەمبەر (ﷺ) خەریك بوو وێنەی قودسم لەبیر بچێ، بەڵام خودا دووبارە وێنەی قودسی هێنا بەرچاوم کەوەك وێنەی شەو بوو، ئیدی بەهۆی ئەمە یەکە بەیەکەی مزگەوتی قودسم بۆ باسکردن، کاتێ سەیری زاری پێغەمبەریان دەکرد کەقسەکانی هەمووی لەجێنە، یەکە بەیەکەی دارو دیواری قودسی دیوە، ئەگینا چۆن دەزانێ بەم چەشنە باسی قودس بکات، چونکە قودس مانگە ڕێیەك دوورە، هەروا پێغەمبەر (ﷺ) خۆی پێشتر قودسی نەدیوە. پاشان گوتیان هیچ لەقافلەی بازرگانەکانی ئێمەت لەڕێگەدا دیوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: بەڵێ بەلای قافلەی کاروانی فیسار هۆز تێپەڕیم لەروحاء وشترێکیان ون کردبوو بەدوایدا دەگەڕان، دۆلکە ئاوێك لەئەوێ بوو من زۆرم تێنوو بوو ئاوم لەدۆڵکەکە خواردەوە، پاشان لەجێی خۆی دام نایەوە، ئەگەر هاتنەوە لێیان بپرسن دۆڵکەکە ئاوی تیدا نەمابوو! ئەمەش موعجیزەیەکی ترە.

هەروا پێغەمبەر (ﷺ) گوتی بەلای قافلەی فیسارو فیسکە تێپەڕیم، پاشان بەپێغەمبەریان گوت باسی قافلەی ئێمە بکە چەندو چۆنو لەکوێ بوون؟ ئەمەش وەك ئەوانیتر خودا وێنەی هێنا پێش چاوو بەرچاوی خۆشەویست، گوتی ئەوەندە وشترەیە، ئەوەندە بارەیان لەسەرە، وشترێك لەبەرایی رادەڕوات، ڕەنگی گەنمییە دوو جواری لەسەر پشت بەیانی دەگاتە لاتان ، ئیدی خوا خوایان بوو بەیانی بێت، بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەدرۆ بخەنەوەو بەڵام کەبەیانی هات یەکێك

گوتی: ژمارەی قافلەکان ڕاستە، ئەویتر گوتی: ژمارەی وشترەکانی ڕاستە، دواتر لەنێو خۆیاندا گوتیان ئای لەم جادوو بازە!! .

## المعراج بەرزبوونەوە

(المِعراج): بەکەسرەی میمە لەسەر کێشی (مفعال) لە (العروج) هاتووە واتا بەرز بوونەوە (کأنە الە) ، کەواتە ئەم وشەیە واتای بەرز بوونەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیەنێت لەزەمینەوە بۆ ئاسمان.

پێشەوا بوخاری چوونە ئاسمانو شەوڕۆی لەدوو باسی سەرەکی باس کردووە، بەڵام کاتێ دەگاتە باسی نوێژ فەرز کردن هەردووکیان بەیەکەوە باس دەکات، کەواتە هەردووکیان لەتاقە شەوێکدا بوونە، بەڵام هەریەکەیان باسێکی سەربەخۆیان بەخۆوە گرتووە نەك خەوتوو بەجەستەوە، نەك بەخەون، هەروا هەندێ فەرموویانە ئەم ڕوداوە دوو جار ڕویداوە لەکاتی بەئاگاییو لەکاتی خەوتن زۆربەی زانایان دەڵێن لەمانگی ربیع الاول بووە، لەپێش کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بەساڵێك. هەندێ زانا فەرموویانە لەمانگی ڕەجەب بووە، پێنج ساڵ لەپێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ)[٥٣] .

## شێوەی بۆراق

(بەیهەقی) دەڵێ: بۆراق گیاندارێکە لەچەشنی هێستر، پێغەمبەرەکانی پێش پێغەمبەریش سواری پشتی ئەم گیاندارە بووینە (ابن اسحاق) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) گوتی شتی ئاوا جوانم نەدیوە وەك بۆراق، بگرە ئەو گیاندارەیە (یمد الیە المیت عینە إذا احتضر) ئەگەر گیانەڵا نیشانی بدەی سەیری دەکات، ئەوەندەی چاوەکانی دەدیت ابن سعد لەواقدی دەگێڕێتەوە کەبۆراق دوو باڵی هەبووە فڕیوە، کەچی فەرموودەکە دەڵێ کاتێ پێی لەشوێنێ دادەنا بەدرێژای چاوی پێی لەئەو شوێن دادەنا بۆی هەیە مەبەستی لەفڕین بێت[٥٤].

(وعن انس ان النبي اتى بالبراق ليلة اسرى به ملجما مسرجا فاستصحب عليه فقال له جبريل ابمحمد تفعل هذا) ؟ ئەو شەوەی پێغەمبەرمان شەوڕۆی پێدەکرێ بۆراق لغاوو زین دەکەن و بۆی دەهێنن بەڵام بۆراق لاملی دەکات و ڕێ بەپێغەمبەرمان نادات سەری بکەوێت، جبریل دەڵێت ئەمە دەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لاملی دەکەی، (فما رکبك احد اکرم على الله منه)، لەوەتەی تۆ هەیت، کەسێکی وەك محمد سواری پشتت نەبووە، (قال فارفضّ عرقا)، سند حسن. ئیدی بۆراق لەشەرمان ئارەقەی شەرمەزاری ڕشت.

(عن بريدة عن النبي لما انتهينا الى بيت المقدس قال جبيرل بأصبعه فخرق بها الحجر)، پێغەمبەرمان گوتی کاتێك گەیشتینە (بيت المقدس) لەئەوێ جبریل بەپەنجەی ئاماژەی لەبەردی (صخرة الله) کردو بەردەکە کونبوو، وشدّ به البراق، بۆراقەکەی لێیەوە بەستەوە. ت. سند حسن[٥٥] .

## پێغەمبەر(ﷺ) لەنێو ئاسمانەکاندا:

لەپاش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) (بيت المقدس) ی جێهێشت بەرەو ئاسمانەکان کەوتە ڕێ لەگەڵ جبریل بەیەکەوە بە سواری بۆراق، جبریل ئاسمان بەئاسمان لەدەرگەی ئاسمانی دەدا دەرگەوانی ئاسمان دەیگوت کێیە؟ لەدەرگا دەدا، ئەویش دەیگوت جبریلە لەگەڵ محمد پێغەمبەر (ﷺ)، لەئاسمانی یەکەم چاوی بە ئادەم پێغەمبەر کەوت و سڵاوی لێ کرد، ئەویش سڵاوەکەی وەرگرتەوە. لەئاسمانی دووهەم عیسا پێغەمبەر و یەحیا، لە ئاسمانی سێهەم یوسف پێغەمبەر، لەئاسمانی چوارەم ادریس پێغەمبەر لەئاسمانی پێنجەم هارون لەئاسمانی شەشەم موسی لەئاسمانی هەفتەم ابراهیم .

لەپاشان هەر بەبۆراقەکە دەگەڵ جبریل بۆ سەرەوە تر ڕۆیشتن، کە بە(سدرە المنتهى) ناسراوە درەختێکی زۆر گەورە فریشتەی خودا گەلێك زۆر دەورەیان

دابوو، ئیدی (رفرف) هات بۆراق و جبریل جێمان نەیتوانی هەنگاو لەسدره المنتهی بە سەرەوەتر، جبریل گوتی من ناتوانم هەنگاوێکی تر بهاوێم ئیدی (وقد ورد فیه اخبار صحيحة فقد روى انه صلى الله عليه وسلم لما جاوز سدرة المنتهى ليلة الاسراء غشيته سحابه من نورفيها من الألوان ماشاء الله فوقف جبريل ولم يسر معه فقال له اُتتركني اسير منفردا فقال له جبريل: وما منا إلا له مقام معلوم، فقال النبي سر معي ولو خطوة فسار معه خطوة، فكاد ان يحترق من النور والجلال والهيبة وصغر وذاب حتى صار قدر العصفور فأشار على النبي بأن يسلم على ربه إذا وصل مكان الخطاب، فلما وصل النبي إليه، قال: التحيات المباركات الصلوات الطيبات لله، فقال الله تعالى: السلام عليك ايها النبي ورحمة الله وبركاته، فأحب النبي ان يكون لعباد الله نصيب من هذا المقام فقال: السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، فقال جمع اهل السموات: اشهد ان لااله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله[٥٦].

ئیدی ئەمانە گفتوگۆی خوداو پێغەمبەر (ﷺ) و فریشتەکان بوو، هەروا خودا (٥٠) نوێژی لەسەر پێغەمبەرو ئومەتەکەی فەرز کرد پێغەمبەر(ﷺ) تووشی موسا پێغەمبەر (ﷺ) بۆوە لەئاسمانی شەشەم، موسا فەرمووی خودا چی لەسەر فەرز کردی پێغەمبەر (ﷺ) گوتی (٥٠) نوێژ لەهەموو شەوو ڕۆژێکدا، موسا گوتی بەخودا من شارەزای خەڵکم بڕۆ داوا لەخوا بکە کەبۆت کەم بکاتەوە تابوە ٤٠ – ٣٠ – ٢٠ – ١٠ – ٥[٥٧].

ئیدی موسا پێغەمبەر (ﷺ) پێنج نوێژەکەشی لا زۆر بوو فەرموویەتی بڕۆ لەبەر خودا بپاڕێوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی یا موسا شەرم دەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر شتی دیت لەشەوی میعراج بۆ نمونە فەرمویەتی: (مر على قوم يزرعون ويحصدون في يوم واحد وكلما حصدوا عاد الزرع كما كان، فقال ماهذا ياجبريل؟ فقال هؤلاء المجاهدون في سبيل الله تضاعف لهم الحسنات الى سبعمائة ضعف، ومر على اقوام ترضخ رؤوسهم الحجارة كلما رضخت عادت كما كان فقال ياجبريل من

هؤلاء؟ قال هؤلاء الذين تتثاقل رؤسهم عن الصلاة المكتوبة، واتى على قوم على اقبالهم رقاع وعلى ادبارهم رقاع يسرحون كما تسرح الابل والغنم ويأكلون الضريع وهو اليابس من شوك والزقوم ويأكلون رضف جهنم أي حجارتها المحماة التي تكون بها قال من هؤلاء ياجبريل؟ قال هؤلاء الذين لايؤدون صدقات اموالهم المفروضة عليهم، فأتى على قوم بين ايديهم لحم نضيج في قدور ولحم نيء ايضا في قدور خبيث فجعلوا يأكلون من ذلك النيء الخبيث ويدعون النضيج الطيب، فقال ماهذا ياجبريل؟ قال هذا الرجل من امتك تكون عنده المراة الحلال الطيب فيأتي امراة خبيثة فيبيت عندها حتى يصبح والمراة تقوم من عند زوجها حلالا طيبا فتأتي رجلا خبيثافتبيت عنده حتى تصبح فرأى رجلا يسبح في نهر من دم يلقم الحجارة فقال من هذا؟ فقال آكل الربا. ومر على قوم بطونهم امثال البيوت كلما نهض وقع ماهذا؟ قال هؤلاء اكلة الربا، فأتى على قوم تعرض السنتهم وشفاههم بمقاريض من حديد كلما قرضت عادت ، فقال من هؤلاء ياجبريل؟ فقال هؤلاء خطباء الفتنة خطباء امتك يقولون ما لايفعلون، مر على قوم اظفارهم من نحاس يخمشون وجوههم وصدورهم فقال من هؤلاء يا جبريل؟ فقال هؤلاء الذين يأكلون لحوم الناس ويسعون في اعراضهم، فاتى على جحر يخرج منه ثور عظيم فجعل الثور يريد ان يرجع من حيث يخرج فلا يستطيع فقال ماهذا؟ فقال هذا رجل من امتك يتكلم الكلمة العظيمة ثم يندم عليها فلا يستطيع ان يردها، فأتى على واد فوجده طيبا بارداً ريحه ريح المسك وسمع صوتا فقال ياجبريل ماهذا؟ قال هذا صوت الجنة تقول يارب اتني ماوعدتني، فأتى على واد فسمع صوتا منكرا ووجد ريحا خبيثة فقال ماهذا ياجبريل؟ قال صوت جهنم تقول يارب اتني ماوعدتني.ومر على شخص منتصبا عن الطريق يقول هلم يا محمد قال جبريل سريا يا محمد فقال عليه السلام من هذا؟ قال عدو الله ابليس اراد ان تميل إليه، ياعلى رايت ليلة اسرى بي الى السماء رايت نساء امتي يعذبن في النار بأنواع من العذاب فبكيت لما رايت من شدة عذابهن ، رايت امراة

معلقة بشعرها يغلى دماغها. لاتغطى شعرها من الرجال، ورايت امراة معلقة بلسانها والحميم يصب في حلقها يؤذي زوجها[٥٨].

ئەی موسلمانی بەڕێز :ئەگەر بێت تاوێك بنواڕینە ئەو ئایەت و فەرموودانە دەرهەق دۆزەخ گوتراون لەلایەن خوداو پێغەمبەر (ﷺ) ئەوا بۆ مان دەردەکەوێت کەوا سزای بەئێش و سزای مەزن و سزای کوشندەو سزای ڕسواکار هەروەك خودا فەرموویەتی: (عذاب عظيم) (عذاب اليم) (عذاب شديد) (عذاب مهين) .هەروا دەرگەکانی دۆزەخ هەفت دەرگەن، هەفتا ساڵە ڕێ قووڵەو گڕی ئاگرەکەی (٦٩) جار گەرمترە لەئاگری دونیا، بزانە پێغەمبەرمان (ﷺ) لەئەو شەوەی کەوا چووە ئاسمان هەزارەها خۆشی و ناخۆشی دۆزەخ و بەهەشتی دەرکەوت.بۆ نموونە بەلای دەستەیەك تێپەڕی لەڕۆژێکدا دەیانچاندو دەیاندووریەوە، پرسیاری کرد ئەمە چ شتێکە، جبريل گوتی:ئەمانە خەبات کەرانی ئیسلامن لەپێناو خودا، پاداشتیان ئەوەندە زۆرە وەك ئەم کێلگەیەی دەبینی هەروا بەلای دەستەیەك تێپەڕی بەردی گەورەیان لەسەر دادەنان و سەریان دەشکاندن و سەریان وەك جاری پێشوو چاك دەبۆوە، لێیان دەدانەوە فەرمووی: ئەمانە کێن، جبريل گوتی ئەمانە لەکاتی هاتنی نوێژ سست بوون، پێغەمبەر (ﷺ) بە لای دەستەیەکی دی تێپەڕی وەك وشتر لەگۆماوی خوێن و خیزاوی دۆزەخ دەلەوەڕان و دەیانخواردەوە فەرمووی ئەمانە کێن؟ جبريل گوتی : ئەمانە زەکاتی سامانی خودایان نەدەدا . بەلای دەستەیەکی دی تێپەڕی گۆشتی جوان و خاوێن و گۆشتی گەندەیان لابوو، بەڵام گۆشتە گەندەکەیان دەخوارد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەمانە کێن؟

جبريل گوتی: ئەمانە نەدەچوونە ژنە مارەکراوەکانی خۆیان، یان ژنەکان نەدەچوونە لای مێردەکانی خۆیان، بەڵکو تابەیانی دامەن پیسیان دەکرد. هەروا پێغەمبەرمان (ﷺ) بەلای دەستەیەکی تر تێپەڕی لەنێوزێی پڕلەخوێنەوە مەلەیان دەکردو بەردیان دەخوارد فەرمووی : ئەمانە کێن؟ جبريل گووتی سووخۆربوون

.هەروا پێغەمبەر (ﷺ) بەلای دەستەیەك تێپەری ورگیان وەك خانوو گەورەبوو قیت دەبوونەوە دەکەتنەوە خوار فەرمووی : ئەمانە کێن؟ جبریل گوتی ئەمانە سوو خۆر بوون .پێغەمبەر (ﷺ) بەلای دەستەیەك تێپەڕی زمان و لێویان بەمەقەسی ئاسن دەبڕا فەرمووی :ئەمانە کێن، جبریل گوتی ئەمانە زانایەکانی ئومەتی تۆبوون ئەوەی دەیان گوت کاریان پێنەدەکرد . بەلای دەستەیەکی تر تێپەڕی نینۆکیان لەمس بوو رووی خۆیانیان پێی دەرنیەوە فەرمووی ئەمانە کێن ؟جبریل گوتی : ئەمانە غەیبەتی خەڵکیان دەکرد . هەروا گایەکی گەورەی دی لەکونێکەوە دەرچوو،نەیدەتوانی لەکونەکە بچێتەوە ژوور، فەرمووی ئەمانە کێن ؟جبریل گوتی ئەمە پیاوێك قسەیەکی گەورەی کردوە ،ئەوەندەی پەشیمان دەبێتەوە دادنادات.هەروا پێغەمبەر (ﷺ) بەلای شێوێك تێپەڕی، بایەکی فێنکی لێوە دەهات، دەنگی دەیگوت خودایە ئەم گفتەی پێت داوین پێمان بدە پێغەمبەر (ﷺ) گوتی ئەمە کێیە جبریل گوتی ئەمە دەنگی بەهەشت بوو .هەروا بەلای شێوێکی گەندە تێپەڕی دووبارە دەنگێك دەهات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :ئەمە دەنگی کێیە؟ جبریل گووتی :دەنگی دۆزەخە دەڵێت خودایە پڕم بکەوە.

هەروا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : پیاوێکم دی لەچەقی ڕێیەوە وەستا بوو، بانگی کردم جبریل گوتی:نەچی ئەوە شەیتانە ، هەروا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی علی لەو شەوەی چوومە ئاسمان ژنەکانم دی لەئومەتی خۆم بەهەمە چەشن سزادەدران، لەبەر سزای ئەوانە گریان دایگرتم، ژنی ئاوام دی بەقژیەوە هەڵواسرابوو ، دەماغی دەکولاّ ئەمە لەدونیا ژنێکی سەرکۆت و ڕووت بوو ژنی ئاوام دی بەزمانیەوە هەڵواسرابوو، ئاوی گەرمیان لەقورگیەوە دەکرد ئەمە لەدونیا ئازاری پیاوەکەی دەدا .

*خودایە پەنا خودایە پەنا*

*گۆمانێك نییە دونیایە فەنا*

*خوشکان هەتاکەی بێزاری ئابڕوون*

*نەکەن دەربچن لەشیعری مەلا*

ئاشکرایە سەرجەم فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکگرتوێتی ئەوە نیشان دەدەن کە پێغەمبەر (ﷺ) لەمزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی قودس چووە، تائێرە قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی کردووە، شەوڕۆکەی جارێك بووە، زەهری دەڵێ: ئەم ڕووداوە لەپێش کۆچ کردن بووە لەکاتی بەخەبەری لەمەککەوە بۆ قودس، بەسواری بۆراق کاتێ گەیشتە قودس، جبریل ئاماژەی بۆ بەردی صخرە الله کردو بەردەکە کون بوو، بۆراقەکەی لێی بەستایەوە . پێغەمبەر (ﷺ) دوو ڕکات نوێژی مزگەوتی کرد، پاشان بەرز بۆوە دەگەڵ جبریل، ئاسمان بەئاسمان، لەهەموو ئاسمانەکان سڵاوی لەپێغەمبەرەکان دەکرد، موسی لەئاسمانی شەشەم بوو ابراهیم لەهەفت بوو پێغەمبەر (ﷺ) لەئەویش تێپەڕی، تاگەیشتە شوێنێك زیکە زیکی پێنووسی فریشتەکان دەهات، سدرە المنتهی کە پڕ بوو لەفریشتەی خودا فەرشی زێڕی ڕەنگاوڕەنگ، پێغەمبەر (ﷺ) لەئەوێ جبریلی دیت ٦٠٠ باڵی هەبوو، ئەمە وێنەی سەرەکی خۆی بوو، ڕەفرەفێکی سەوزی دیت، بیت المعموری دیت کەمزگەوتێکە لەئاسمان لەجیاتی کەعبەی ئێمەیە، هەموو ڕۆژێك ٧٠ هەزار فریشتەی خودا بەدەوریدا دەسوڕێنەوە بەبێ دووبارە، بەهەشتو دۆزەخی دیت، نوێژی لەسەر فەرز کرا کەژمارەیان ٥٠ نوێژ بوو، تا بەهۆی موسی پێغەمبەر خودا بۆی کردە پێنج نوێژ پاشان دەگەڵ جبریل هاتەوە بیت المقدس، نوێژی بەیانی دەگەڵ پێغەمبەرەکان لەبیت المقدس کرد، خۆی بووە بەرنوێژیان، هەندێ لایان وایە بەر نوێژییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەئاسمان بووە، بەڵام فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وانیشان دەدەن پێدەچن کە لەبیت المقدس بووە. هەندێکیان دەڵێن لەسەرەتای چوونی بووە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە لەکاتی گەڕانەوەی بووە، ئیدی لەپاش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) گەشتی زەوی‌و ئاسمانی بۆ کرا، بەناوی عەبدەوە بانگکرا، دیارە لەپاش ئەوەی گەشتێکی بەخێرو

بیری کردو گەڕایەوە ، ئەمجا بەرنوێژیەکەی کردووە، ئیدی بەنسبەت دیتنی خودا، البیهقی دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) خودای نەدیوە، هەروا عائشەو ابن مسعودو ابوهریرە هەروەك یارانی پێغەمبەر (ﷺ) پێچەوانەی ئەم ڕایەشن، لەهەمان کاتدا لەفەرموودەی موسلم هاتووە بەپێغەمبەریان گوت (هل رایت ربك فقال نور انی اراه، رایت نورا) دەڵێن ئایەتی (ثم دنا فتدلی) ئاماژەیە جبریلی دیوە، لەسەر شێوەی خۆی هەروەك لەفەرموودەی ڕاستدا هاتووە، ئەمەش ڕای عائشەو ابن مسعودو ابوهریرەیە، یاران پێچەوانەی ئەم ڕایە نینە[٥٩].

١- خودای مەزن هەرکارێك بکات، چاوی لەدەستی کەس نیەو نەبووەو نابێت، جائەگەر لەهەندێکی شەو گەشتێکی دوورو درێژ بەپێغەمبەری سەروەر بکات، لەسەر بڕوادار ئەوەیە تەنها مەردانە، وەك ابوبکر الصدیق کەبەهۆی ئەم ڕووداوە سیفاتی الصدیقی پێدرا بڵێ (إن الله علی کل شيء قدیر)، ئەمەش بۆ ئەوەیە کەوا دەسەڵاتی خۆدا بخاتە ڕوو.

٢- پێغەمبەر (ﷺ)، لەخەمو پەستیەکی زۆر بوو، چونکە لەلایەك (خەدیجە)ی خێزانی مەرگی خودای بەجێ هێنابوو، لەلایەك (ابوطالب)، بۆیە ساڵی مەرگی ئەمانە بەساڵی پەست ناوزەد کرا (عام الحزن)، ئەمانەش دوو کۆڵەگە بوون بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، جگە لەئەمانەش پێغەمبەرو هاوەڵان زۆر ئازار دەدران جابەهۆی ئەم ڕووداوە خودا دڵی پێغەمبەری دایەوەو کردیە میوانی خۆی.

٣- هەروا لەڕووداوی سیرە ئەوەدەگیرێت کەڕاگەیەنەر نابێ ترسنۆك بێت، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) لەکەس نەترساو ئەم ڕووداوەی گێڕاوە، گوێی بەقسەی ام هانی نەدا کەئامۆزای بوو.

٤- خودا فەرموویەتی (سبحان الذي اسری بعبده) ، واتا ئەو خودایەی شەوڕۆی بەبەندەی خۆی کرد ، زانایان دەفەرموون ئەگەر ناوێکی چاکتر هەبوایە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) خودا بەئەو ناوە بانگی پێغەمبەر (ﷺ)ی دەکرد، نەك بەعبد بەڵام دیارە عبد گەورەترین ناوە[٦٠].

# یەکەمینەکان

یەکـەم کۆچی موسڵمانان بۆ حەبەشە بوو. یەکـەم خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) خدیجە بوو. یەکـەم. سورەت دابەزی سورەتی عەلەق بوو. یەکـەم نوێژێ فەرزکرا نیوەڕۆ بوو. یەکـەم منداڵی پێغەمبەر(ﷺ) زەینەب بوو. یەکـەم خانوو دانرا بۆ خوداپەرستی مەککە بوو. یەکـەم کەس دەچێتە بەهەشت پێغەمبەرە(ﷺ) یەکـەم کەس کەداوای پێغەمبەرایەتی کرد عەبهەلە بوو. یەکەم کەس موسلمان بوو لەژنان خەدیجە بوو. یەکەم کەس موسلمان بوو لە منداڵان پێشەوا عەلی بوو. یەکـەم کەس موسلمان بوو لەپیاوان ئەبوبەکر بوو. یەکەم کەس کۆچی کرد بۆ حەبەشە پێشەوا عثمان بوو. یەکەم ئەنصاری کوژرا عومەیری حەمام بوو. یەکەم کەس کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەبو سلمە اسد بوو . یەکـەم منداڵ لەئیسلامدا لەدایك بوو عەبدوڵڵای جەعفەری ابو طالب بوو . یەکـەم ژنێ پێغەمبەر(ﷺ) گواستیەوە خەدیجە بوو. یەکـەم کەس دینی ئیسماعیل پێغەمبەری گۆڕی عەمری لوحە بوو. یەکـەم کەس نوختەی لەسەر پیتەکانی قورئان دانا نەصری عاصمی لیس بوو. یەکـەم غەزای ئیسلام غەزای ابواء بوو. یەکـەم کەس پرسیاری لەژمارەی پیتەکانی قورئان کرد حەجاجی یوسفی سەقەفی بوو. یەکەم مزگەوت قورئانی تیادا خوێندرا لە مەدینەدا مزگەوتی زریق بوو. یەکەم ژن لەپاش پێغەمبەر (ﷺ) مرد، زەینەبی جەحش بوو. یەکەم منداڵی ئەنصاری لەپاش کۆچ لەدایك بوو عثمان بەشیر بوو. یەکـەم شەهید دوو ڕکات نوێژی لەپیش شەهید بوون ئەنجامدا خوبەیبی عەدی بوو. یەکـەم کەس لەبەقیع شاردرایەوە عثمان مضعون بوو . یەکـەم کەس زانستی ئوسول فقهی دانا شافیعی بوو. یەکەم کەس فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆکردەوە محمدی شەهابی زوهری بوو. یەکـەم کەس فەرموودەی دروستی کۆکردەوە بوخاری بوو. یەکـەم کەس کەزانستی عەروزی دانا خەلیلی احمد بوو . یەکەم ژن گوێیان سمی هاجەرە بوو. یەکەم ژنە جولەکە ویستی پێغەمبەر (ﷺ) بەژەهر بکوژێت زەینەبی حارس

بوو. **یەکەم** شەهیدی بەدر مهجع بوو. **یەکەم** کەس حەجی بەدزی کرد خالیدی وەلید بوو. **یەکەم** سەفیری ئیسلام موصعبی عومەیر بوو. **یەکەم** لێ پرسینەوەی دوارۆژ لەسەر نوێژە **یەکەم** کەس لەکەعبە دا بانگی‌دا بیلال بوو. **یەکەم** کەس قورئانی لەمەککەدا بەئاشکرا خوێند عەبدوڵلای مەسعود بوو. **یەکەم** ئایەت لەبارەی جەنگ هاتە خوارەوە ئایەتی (٣٩) بوو لەسورەی حەج. **یەکەم** کەس پێش نوێژی بۆ موسلمانان کرد لەمەدینەدا موسعەبی عومەیر بوو. **یەکەم**ماڵی موسلمان بوون لەمەدینەدا ماڵی بەنوعەبدی اشهەل بوو.**یەکەم** کۆچکار لەمەدینەدا کلاد عوسمانی مضعون بوو. **یەکەم** پاشا کەفەرمانی کرد بەوەرگێڕانی پەرتووکان بۆ سەر زمانی عەرەبی ابوجعفەری منصور بوو. **یەکەم** رۆژنامە بەزمانی عەرەبی دەر چوو رۆژنامە الوقائع المصریه بوو. **یەکەم** جار قورئان کۆکرایەوە لەسەردەمی ابوبکر بوو. **یەکەم** کەس ناوی نرا امیر المؤمنین پێشەوا عومەر بوو. **یەکەم** کەس پێش نوێژی کرد لەپاش پێغەمبەر ئەبوبەکر بوو. **یەکەم** منداڵ لەدایك بوو لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلام عەبدوڵلای زوبەیر بوو. **یەکەم** کەس تفی پێغەمبەر(ﷺ)ی لەزار کرا عەبدوڵلای زوبەیر بوو. **یەکەم** کەس خەیبەری گرت پێشەوا عەلی بوو. **یەکەم** کەس لەجەنگی بەدر دەرکەوت عەلی بوو **یەکەم** کەس راوێژی لەگەڵ ئەبوبەکر کرد بۆ کۆکردنەوەی قورئان پێشەوا عومەر بوو. **یەکەم** کەساڵی کۆچی دانا پێشەوا عومەر بوو. **یەکەم** کەس کەخەڵکی کۆکردەوە بۆنوێژی تەراویح پێشەوا عومەر بوو. **یەکەم** کەس تیری لەپێناوی خودادا هاوێشت سعدی وقاص بوو. **یەکەم** کەس دڵی نەشتەرگەری کردو بەشەکانی لەیەك جیاکردەوە ابن سینابوو. **یەکەم** کەس دەرزی لەژێر پێست دا ابن سینا بوو. **یەکەم** نیشانەی موسلمانەتی دوو ووشەی شادەیە. **یەکەم** کەس شەرواڵی لەبەرکرد ئیبراهیم پێغەمبەر بوو. **یەکەم** کەس لەپاش پێغەمبەر (ﷺ) دەچێتە بەهەشت ئەبو بەکرە. **یەکەم** مرۆڤ خودا دروستی کردو کردی بە پێغەمبەر ئادەم بوو. **یەکەم** شتێ خودا دروستی کرد پێنووس بوو. **یەکەم** شتێ

لەسەرەتای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەستی پێکرد خەون بوو . **یەکەم** کەسێ شەهید بوو لەژنان سمیە بوو. **یەکەمین** کەس قوماشی لەسەر کەعبەی پیرۆز دانا توبەع بوو. **یەکەم** کەس لەپاش پێغەمبەر(ﷺ) مزگەوتی دروست کرد عماری یاسر بوو. **یەکەم** درەخت لەزەوی شین بوو دارخورما بوو. **یەکەم** کەس نازناوی امیری لێنرا عەبدوڵڵای جەحش بوو هاوەڵێکی پێغەمبەرە(ﷺ). **یەکەم** کەس غەنیمەی لەکافران گرت عەبدوڵڵای جەحش بوو. **یەکەم** هاوەڵ شمشێری لەکالان دەرهێنا لەسەر بەرگری پێغەمبەر زوبەیری عەوام بوو. **یەکەم** جەنگ روویدا لەنێو موسڵمانان وکافران جەنگی بەدر بوو. **یەکەمین** کەس لەعێراقدا بووە قازی، سەلمانی رەبیعەی باهیلی بوو. **یەکەمین** مردوو کێلی بۆدانرا عثمان مضعون بوو برای شیری پێغەمبەرە. **یەکەمین** کەس خەتەنەو (سورانە)کرا ئیبراهیم پێغەمبەر بوو. **یەکەمین** جەنگی ئاوی لەنێو مسوڵمانان جەنگی زاتول سواری بوو کەلەساڵی (٣٥) کۆچی روویدا. **یەکەمین** منداڵە موسڵمان لەحەبەشە لەدایك بوو عەبدوڵڵا جەعفەر بوو. **یەکەمین** کەس لەجەنگی بەدر هاتە مەیدان عەبدوڵڵا رواحە بوو. **یەکەمین** لێ پرسینەوەی دوا رۆژ لەسەر خوێنە واتا: کوشتن. **یەکەمین** کەس مولودی پێغەمبەری کرد سولتان موزەفەر بوو. **یەکەمین** شت کەخودا دروستی کرد پێنووس بوو. **یەکەمین** کەس دەعیەی کرد شەیتان بوو. **یەکەمین** پاشا سکەی بۆ پارەو دراوی موسلمانان دا ولیدی عبدالملك بوو. **یەکەمین** کەس قودسی گرت پێشەوا عومەر بوو. **یەکەمین** ژن لەپاش خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر موسلمان بوو ام فضل بوو خێزانی عەباسی مامی پێغەمبەر بوو **یەکەمین** کەس پێش نوێژی بۆ موسلمانان کرد لەمەدینەدا مصعبی عمر بوو. **یەکەمین** کەس نوێژی تەرمی بزری (صلاة الغائب) لەسەرکرا نەجاشی بوو. **یەکەمین** کەس چووە ئاسمان پێغەمبەر(ﷺ) بوو[٦١].

# موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ)
# بەردەکەی أبوجهل

دەگێڕنەوە لە (عبدالله ی عباس) : گوتی: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ قورەیشیەکان وتووێژی کرد لەبارەی ئاییینی پیرۆزی ئیسلام، ئەوەبوو، ئەوان وەرامی پێغەمبەریان (ﷺ) نەدایەوە، (أبوجهل) گوتی: ئەی قورەیشینە! بەڕاستی محمد ڕێبازی ئێمەو باووباپیرانمانی بەهەڵە داناوەو واز لەئەو ئاییینە ناهێنێ، جامن گفتو پێ دەدەم، کەوا بەیانی کامە بەردی گەورەیە لەئەو کاتەی دەچێتە سوژدە لەتۆقی سەری دەدەم. ئەوەبوو بەیانی پێغەمبەر (ﷺ) چووە نوێژ بەڵام ئاگای لە (أبوجهل) نییە کەوا خەریکی چ نەخشەیەکە. ابوجهل کامە بەردی گەورەیە هەڵی گرتو پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژ بوو، لەسەری پێغەمبەری (ﷺ) بدات، بەڵام دەستی شل بوو، بەردەکە کەوتە خوارو خەڵکەکە چوونە لای گوتیان تۆ دوێنێ دەتگوت: ئەگەر قەدەغەم بکەن، یاتەسلیمم بکەن، من هەرلەمحمد دەدەم ئەی بۆ وات لێهات؟ گوتی: کاتێ لەمحمد ەبەردەوە نزیك بوومەوە بوشترێکی نێرە هاتو شتی وام نەدیوە، چ باڵایەكو گەردەنێكو ددانێکی هەبوو.. خەریك بوو بم خوات، لەترسان بەردەکەم لەدەست کەوتەخوار! .

# زۆرانبازی پێغەمبەر (ﷺ) و رکانە

دەگێڕنەوە: لە (ابن إسحاق): پیاوێ هەبوو بەناوی (رکانەی عبدیزید)ی (هاشمی عبدالمطلب) لەهەموو قورەیشیەکان بەهێزتر بوو. جارێ لەرێیەك لەرێیەکانی مەککە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بەیەك گەیشتن. پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: لەخوا بترسە موسلمان بە! هەرداوایەکت هەیە بۆت گیرادەبێ، گوتی: ئەگەر من باوەڕم بەتۆ بێ، بەدوات دەکەوم، پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: باشە ئەگەر تۆم لەعەردی

دا باوەڕم پێدەکەی؟ گوتی بەڵێ. پێغەمبەر (ﷺ) لەعەردیدا. باوەڕی پێنەکرد. گوتی بادووبارە زۆرانە بکەین، دووبارە پێغەمبەر (ﷺ) لەعەردیدا. رکانە گوتی: سەیرە تۆ من لەعەردی دەدەی. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر باوەڕم پێبکەی بانگی ئەو درەختە دەکەمو دێت. بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) بانگی درەختەکەی کردو درەختەکە هات. رکانە گوتی: بابچێتەوە جێی پێشوو، پێغەمبەر (ﷺ) بەدرەختەکەی گوت: بڕۆ بۆ جێی پێشوت. ئینجا رکانە بەخزمەکانی خۆی گوت: جادوو گەرانی زەوی بۆ لای ئەم پیاوە بهێنن، من جادوو گەری ئاوام نەدیوە. ڕووداوەکەشی گێڕاوە.

## (عبداللە)ی مسعود.

دەگێرنەوە :لە (أبوبکری عیاش) لەو کاتەی (عبداللەی مسعود) شوانی (عوقبەی موعیط) بوو، جارێ پێغەمبەر لەگەڵ (أبو بکر) تووشی بوون. پێغەمبەر بە (عبدالله)ی گوت: مەڕی شیردەرت لانیە ؟(عبد الله) گوتی: بەڵێ بەڵام مەڕەکانم هی خۆم نییە، پێغەمبەر فەرمووی مەڕێکی نەزاو بهێنە، ئەویش هێنای پێغەمبەر دەستی بە گوانی داهێنا شیر لەگوانی هاتە خوارو لەگەڵ (أبو بکر) تێریان خوارد لەشیری مەڕەکە لەپاشان پێغەمبەر گوتی: ئەی گوانە بگەڕێوە سەر چەشنی جاران! ئینجا (عبدالله) گوتی: لە پاش ئەم موعجیزەیە چوومە لای پێغەمبەرو گوتم قسەکم فێر بکە، پێغەمبەر دەستی بەسەری داهێناو گوتی: خودا بەخشندەییت لەگەڵدا بکات تۆ زاناو مامۆستای.

## شێری سومعە

دەگێڕنەوە لە(ابن عساکر) (هبار) گوتی: جارێ من لەگەڵ عوتەیبەو أبو لهب خۆم بۆ شام ئامادە کرد عوتەیبە بە ئەبو لەهبی گوت: والله ی وا دەڕۆم دەچم محمد ئازار دەدەم، هاتە لای پێغەمبەرو گوتی- تۆی ئەو کافرەی دەڵێی چوومەتە ئاسمان؟ پێغەمبەر تەنها ئەوەندەی گوت- خودایە سەگێك لەسەگەکانی خۆتی لە

سەر زاڵ بکەی( اللهم سلط علیه کلبا" من کلا بك) عوتەیبە هاتەوە لای (أبو لهب)ی باوکیو (هبار)ی دۆستیان. باوکی گوتی: محمد چی پێ گوتی – ئەویش قسەکانی گێڕایەوە باوکی گوتی: کوڕم تازە تۆ بەنزای ئەو لەنێو دەچی. ڕۆیشتن بۆ شام لەشوێنی توشی ڕاهیبێ بوون ڕاهیبەکە گوتی: ئەوە بۆ هاتونەتە ئێرە؟ جگە لەگورگ چیتر لێرە نیە، (أبولهب) نزاکەی پێغەمبەری بە بیر هاتەوە، هەستا کوڕەکەی لەژێر چەند نوێنێ شاردەوە گوتی: من خۆم پیرم ، بەلام با کوڕەکەم گورگ نەیخوات، گورگێ هات هەموویانی بۆن کرد کەسی نەخوارد، دووسێ جار لرفاندی و ژێر نوێنەکەی هەڵدایەوەو عوتەیبەی کوشت .

## ابو عامری فاسق

دەگێڕنەوە لە(ابن سحاق) گوتی: کاتێ پێغەمبەر چووە مەدینە. أبو عامری فاسق گوتی: ئەمە چیە هێناوتە؟ پێغەمبەر فەرمووی: ئاینی (أبراهیم) پێغەمبەرە (ابو عامری فاسق) گوتی: من لەسەر ئەو ئاینەم، پێغەمبەر فەرمووی: ڕاست ناکەیت (ابو عامر) گوتی: ئاینەکەی تۆ ڕاست نیە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : نەخێر ڕاستەو پاکەوخاوێنە، ابو عامر گوتی: ئەوەی درۆ دەکات خوا لەدووری و بەتەنهایی و تێهەلدراوی بیکوژێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەڵی، ئەوەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) چووە مەکە، (ابو عامر) لە مکە ڕۆیشت بۆ شام لەئەوێ بەتەنها و لەدووریو بەتێهەڵدراوی مرد.

## شمشێری سلمە

لە(واقیدی) گوتی : لەڕۆژی بەدردا شمشێری (سلمەی أسلمی حریش) شکا،بەبێ چەك مایەوە پێغەمبەر پارچە دارێکی تەڕی پێدا گوتی :جەنگ بەئەوە بکە! بووە شمشێرێکی ئاسن هەمیشە لەلای بوو لەڕۆژی جسری ابی عبید شەهید کرا .

## لەرزینی کێوی أحد

لە(بوخاری) گوتی : جارێ پێغەمبەر (ﷺ)چووە سەر کێوی (أحد) أبو بکر و عمر وعثمانی لەگەڵ دابوو، کێوەکە دەستی بە لەرزین کرد پێغەمبەر فەرمووی: داکەوە، ئەی أحد! تۆ پێغەمبەرو أبوبکر و دوو شەهیدت لە سەرە، ئینجا کێوەکە لەلەرزین کەوت .

## چاك بوونەوەی چاوی کوێری

لە(ابن عبدالبر) گوتی : پیاوێ چاوی سپی بووبوو، بەناوی فویل هاتەلای پێغەمبەر (ﷺ)گوتی: چاوم کوێربووە . پێغەمبەر فەرمووی بۆ ؟ گوتی من لەسەر پشتی وشتر بووم، بە سەر هێلکەی مار داکەوتم، ڕاست چاوم کوێر بوو . پێغەمبەر (ﷺ) فووی لەچاوی کردو چاوی چاك بوو . ئەو پیاوە تەمەنی گەیشتە هەشتا سال داوە دەزی پێوە دەکرد، چاوەکانیشی هەر سپی بوون.

## بێنی خۆشی عتبە

لە(سعیدی نصر) گوتی : عوتبە سێ ژنی هەبوو، ئەوەندە بایەخیان بەبۆنی خۆش نەدەدا لەو کاتەی کە عوتبە دەهاتە لایان .ژنێکی بەناوی ام عاصم گوتی :کەچی عوتبە بۆنی لەهەموومان خۆشتر بوو،هیچ بۆنیشی لەخۆی نەدەدا،منیش پرسیارم لێ کرد ئەمە هۆی چییە ؟ گوتی :من نەخۆشی خورشتم گرت، پێغەمبەر (ﷺ) هەردوو ناولەپی بەیەك داهێناو لەپاشاندا بەزەوی داهێناو ئینجا بە جەستەی داهێنام لەئەو ڕۆژ ئەو بۆنە خۆشەم لێ دێ! .

## چرای پێغەمبەر (ﷺ)

دەگێڕنەوە لە(ابو سلمە) گوتی: جارێ لەشەوە زەنگێ پێغەمبەر (ﷺ) چووە نوێژی عیشا، ڕۆناکیەك هات پێغەمبەر (ﷺ) (قتادە)ی (نوعمانی) دیت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (قتادەیە)، گوتی: بەڵێ، بۆیە بۆ ئەم نوێژە هاتم، زانیم هەموو کەسێك بەئەو تاریکە ناتوانێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کاتێ نوێژەکەت کرد وەرە لام کاتێ نوێژەکەی تەواو بوو (قتادە) هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێغەمبەر (ﷺ) پارچە دارێکی پێداو گوتی: ئەوە بەئەندازەی _ ١٠ _ لەپاش و پێشت ڕوناك دەبێ، بۆی هەیە مەبەستی —١٠_ گەز بووبێ.

## سامی پێغەمبەر (ﷺ)

دەگێڕنەوە کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵای‌دا دەست پێشەوا (علی) کاتێ کەچووە نێو بەنی قریضة پێشەوا علی گوتی: کاتێ لەقەڵاتەکە نزیك بوومەوە گوێم لەدەنگی جولەکەکان بوو قسەی خراپیان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەگوت، بەگورجی گەڕامەوەو لەڕێگە توشی پێغەمبەر (ﷺ) بووم گوتی بۆ گەڕایەوە؟ گوتم نزیکی ئەو پیسانە

مەکەوە من گوێم لەقسەی خراپ بووە بەڵامبەر تۆ، پێغەمبەر (ﷺ) گوتی ئەگەر بم بینن ناوێرن، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هات گوتی: ئەی ئەوانەی خودا ڕیسوای کردن گوتیان: تۆ ڕاست دەکەی!!

## دوو وشترەکە لەکوێیە

دەگێڕنەوە: لە (ابن هشام) گوتی: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگی (المصطلق) گەڕایەوە، (جویریە)ی کچی حارسی لەگەڵ دابوو. جویریە سپاردەیەکی دایە پیاوێکی انصاری گوتی: ئاگات لێ بێ. پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینە، حارس هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کڕینەوەی جویریەی کچی کاتی لە (عقیق) سەیری کردە هەندێ وشتر بۆ فیدیە هێناویانە، دڵی چووە سەر دوو وشترو لەدۆڵێ شاردیەوە. لەلای کەس باسی نەکردو هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: جویریەی کچم لەلای ئێوەیە، منیش هاتومە بۆ کڕینەوەی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی دوو وشترەکەی شاردۆتتەوە لەفیسار شوێن بڕۆ بیان هێنەوە. حارس کە گوێی لەئەو قسەیە بوو یەکسەر موسلمان بوو، دوو کوڕیشی لەگەڵدا بوو ئەوانیش موسلمان بوون، هەروەها خزمەکانی، لەپاشاندا جویریەشی لە پێغەمبەر (ﷺ) مارە کرد. گوتی: بەخودا جگە لەخۆمو خودا کەسی تر ئاگای لەشاردنەوەی ئەو دوو وشترە نەبووە.

## گۆشتی ژەهراوی

دەگێڕنەوە: لە(ابن اسحاق): گوتی : کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەخەیبەر جێنشین بوو، ژنێ بەناوی (زەینب) مەڕێکی کوشتەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، پرسیاری کرد ئایا پێغەمبەر (ﷺ) حەزی لەچ گۆشتێکە؟ گوتیان شانی حەیوان. ژنەکە هەڵسا هەموو گۆشتەکەی لەنێو ژەهرنا، بەتایبەتی شانودەستەکە.

کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ نان خواردن هات لەگەڵ هاوەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) پارویێکی بردە زاری‌و تفی کردەوە، هاوەڵەکەی قوتی‌داو شەهید بوو، پێغەمبەر (ﷺ) بەژنەکەی گوت: بۆچی ژەهرت لەئەو گۆشتە کردوە بۆچی؟ ژنەکە گوتی: لەخەیاڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر پێغەمبەر بێ دەزانێ، ئەگەر پادشاش بێ دەمرێ. ئینجا هەندێ دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) لەژنەکە خۆش بوو، هەندێ دەڵێن ژنەکەی کوشت.

## پێغەمبەر (ﷺ) شتی پەنهانی دیوە

دەگێڕنەوە: لەبوخاری : گوتی لە (ابوهريرة)وە لە پێغەمبەر (ﷺ) . جارێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سوێندم بەخودا لەمن شاراوە نییە، کە ئێوە رکوع‌و سوژدەتان چۆنەو چەندە لەنوێژەکانتاندا، چونکە من لەپشترا دەتان بینم.

## خۆراکی گەشت

دەگێڕنەوە: لە(بوخاری) گوتی: جارێ پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ١٣٠ هاوەڵ لەگەشت دەبن. پرسیاریان لێ دەکات لەخواردن چیتان لەلایە؟ گوتیان تەنها ڕبە خواردنێ . کردیانە هەویرو ، لەپاش کەمێك پیاوێکی کافر هات مێگەلی مەڕی پێ بوو ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مەڕێك بەدیاری، یان بەفرۆشتن کافرەکە گوتی: بەفرۆشتن، پێغەمبەر (ﷺ) لێی کڕی‌و خواردیان بەشی هەمویانی کرد، هەتا دوو قسعەش زیادی کرد.

## جوانی عمری جمیل

لە(ابن عبدالبر) گوتی : عمری أخطب زۆر غەزای لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ)یش نزای بۆ کرد دەستی بەسەری داهێناو (نزای جوانی بۆ کرد) . عمر تەمەنی لەسەدو هەندێ ساڵ تێپەڕی، قژی سەری تۆزێ سپی بووبوو.

## وشتر سکاڵای لای پێغەمبەر (ﷺ) کردووە

لەپێشەوا (احمد).ئەوانیش لە(عبدالله ی جعفر): گوتی: ڕۆژێک من لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) دەڕۆیشتم پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ قسەی نهێنی بۆ کردمو گوتی: لەلای کەس نەدرکێنی ، لەپاشاندا بۆ سەر پێشاو چوو، ئادابی ئاوا بوو، کەپێی خۆش بوو لەکاتی پێشاو بچێتە پەناو حەشارگە. ئەوەبوو چووە ناو بیستانی پیاوێکی (أنصاری) ، وشترێ بەگریان هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) دەستی پیرۆزی بەلەشی وشترەکەدا هێناو وشترەکە کڕبوەوە، لەدواتر گوتی: کێ خاوەنی ئەو وشترەیە؟ گوتی گەنجێکی أنصاری ، گەنجەکە هاتو پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەوە چۆن لەخودا ناترسی، خودا ئەو وشترەی پێداوی برسی دەکەیتو ماندووشی دەکەیت.

## پێغەمبەر(ﷺ)و شاراوە

دەگێڕنەوە: (یزیدی ابن ابي شيبة) گوتی: لەکۆڵانێ لەکۆڵانەکانی مەدینە ژنێ بەلامدا تێپەڕی، منیش پشتێنم گرتو ڕانم گوشی، بۆ بەیانی خەڵك دەچوونە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ پەیمان بەستن لەسەر ئەوەی کەخودا بناسنو نوێژ بکەنو زینا نەکەن، منیش چووم پێغەمبەر (ﷺ) دەستی لەناو دەستی من نەنا گوتی: تۆ پیاوەکەی دوێنێی چیت لەژنەکە کرد، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا جارێکی تر کاری ئاوا دووبارە ناکەمەوە، ئینجا دەستی لەنێو دەستم ناو پەیمانی لێ وەرگرتم.

## نەرمبوونی خەندەق

دەگێڕنەوە: لە(ابن اسحاق): گوتی (جابر)ی (عبدالله) گوتی: لەجەنگی (خندق)، توشی بەردێك بوین، هەرچەندی چەکوشمان لێدەدا نەدەشکا. ئەم ڕووداوەمان بە پێغەمبەر (ﷺ)ڕاگەیاند: ئەویش گوتی هەندێ ئاوم بۆ بهێنن، ئێمەش بۆمان بردو نزای لەسەر کردو لەپاشاندا ئاوەکەی پێداکرد ئەوەندە نەرم بوو، هیچ چەکوشمان بەلاش نەچوو.

## خۆ کوشتنی قەزمان

دەگێڕنەوە: لە (ابن اسحاق)، پیاوێکی ئاوارە دەبێ بەناوێ (قەزمان) هەرجارێ کەلەلای پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەو پیاوە دەکرا، پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ دۆزەخیە، لەجەنگی (أُحد) کەکوشتارێکی زۆری لێ کرا، ئەو (قەزمانە) بەتەنها هەفت هەشت کافر دەکوژێ، یاران دەڵێن: لەخۆی خەنی! پێغەمبەر (ﷺ) دووبارە دەڵێ دۆزەخییە، ئەوانیش دەچنە لای چونکە زامدار بوو، گوتیان موژدە تۆ بەهەشتی، گوتی: من بۆ بەهەشت شەڕم نەکردووە، لە دوایی بەشمشێرەکەی خۆی، خۆی کوشت، ئەمجا یاران گوتیان: پێغەمبەری خودا ڕاستی فەرموو. ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:بەڕاستی خودا بەرگری بۆ ئەم ئایینە دەکات، ئەگەر بەپیاوێکی فاجریش بێ.

## جندب و جادووگەر

دەگێڕنەوە: لە (ابن عبدالبر): گوتی: جارێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : جوندب، دەزانی جوندب چییە؟ لێدانێ دەکات و هەق و ناهەق لەیەك جیا دەکاتەوە گوتی: پیاوێکی فارس هەبوو لەکوفەدا، لەئەوکات (وەلیدی عقبە) فەرمانڕەوای کوفە بوو.

ئەو پیاوە ناوی بوستان بوو، جادووی ئەوەندە سەیری دەکرد دەچوە نێو دەمی کەر لەدامەنی دەردەچو، دەچوە دامەنی لەدەمی دەردەچو ، سەری خۆی پەل دەدا لەپاشاندا چاك دەبووەوە، جاریٚ جندبی کعب کەهاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بوو پێغەمبەر (ﷺ) کەپێی فەرموو: ناهەق و هەق لەیەك جیادەکات هاتە لای ئەو جادوگەرەو شمشێرێکی لەگەردەنی داو گوتی: ئێستا خۆت زیندوو بکەوە، ئینجا وەلید بەندی کرد، پێشەوا عثمان گوتی : جندب بەربدە، بزانە جندب یەکێك بوو لەپیاوە چاکەکانی کۆچکەران.

## نەخواردنی حەرام

دەگێڕنەوە:لە (ابو داود) گوتی: پیاوێکی (أنصاری) گوتی: پیاوێك مردبوو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوین بۆ گورستان، پێغەمبەر (ﷺ) بەگۆڕ لێدەرەکەی گوت لای سەرو پێی گۆڕەکە فراوان بکە. کەگەڕاینەوە لەگۆرستان ژنیٚ بانگی پێغەمبەر (ﷺ) ی کرد بۆ داوەت، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی لەنێو خواردنەکە ناو بانگی هاوەڵانی کردوو بۆ خواردن هاوەڵان سەیری پێغەمبەریان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) پارووی بۆ زاری بردو گوتی: ئەم گۆشتە بەبیٚ پرسی خاوەنەکەی هاتووە؟ ژنەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا من یەکێکم بۆ بازێر ڕەوانە کرد، بچیٚ مەڕێك بکڕیٚ بەلاّم نەبوو، لەپاشاندا کابرام ڕەوانەی ئەو ماڵە هاوسێیە کرد، ئەوانیش بەپارەش نەیان فرۆشت، ئینجا ژنی پیاوەکە بەدزی بیٚ پرسی پیاوەکەی ئەم مەڕەی ڕەوانە کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم گۆشتە بدەنە دیلەکان.

## گەڕانەوەی پەز

دەگێڕنەوە لەخاوەنی پەرتووکی (الاستیعاب) پیاویکی کافری حەبەشی کەشوانی جوولەکەیەك بوو بەناوی عامر هاتەلای پێغەمبەر (ﷺ) بەخۆوبەپەزەوە گوتی: من موسلمان دەبم پێغەمبەریش (ﷺ) چەشنی موسلمانەتی ئاراستە کرد. لەپاشان گوتی :ئەی پێغەمبەر (ﷺ) من شوانی ئەو پەزانەم چیان لێ بکەم ،پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بیان دەوە خاوەنەکەی، ئەویش گۆڵمە بەردێکی خڕکردەوەو گوتی بڕۆنە لای خاوەنەکەتان یەکسەر مەڕەکان چوونەوە لای خاوەنەکەیان، وەك بلێی شوانێك دەیان باتەوە ماڵ لەپاشان دا چووە غەزا ، بەردێکی پێکەوت شەهید بوو، ئەو پیاوە هێشتا نوێژێکی نەکردبوو، پێغەمبەر (ﷺ) چوە سەر تەرمەکەی داپۆشت یاران گوتیان بۆ دات پۆشت گوتی حۆریم دیت گەمەیان لەگەڵ دەکرد، ناوی لەئەو شوانە نا (یساری حبشی).

## بەرووداکەوتنی بتەکانی کەعبە

دەگێڕنەوە : کاتێ پێغەمبەر لەگەڵ هاوەڵان فەتحی مەککەیان کرد، پێغەمبەر (ﷺ) بە دەوری کەعبەدا دەسوڕایەوەو لەنێو کەعبە چەند بتێ بەمس محکەم کرابوو، هەلواسرابوو، پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتەی دووبارەو سێ بارە دەکردەوە (وقل جاءَ الحقُ وزَهَقَ الباطِل انَّ الباطلَ كانَ زَهوقا) سەیری هەر بتێکی دەکرد، بتەکە دەکەوتە سەر پشت دووبارە تەماشای هەر بتێکی دەکرد، تاهەموویان کەوتنە سەر ڕوو.

# گریەو ناڵەی مینبەر

دەگێڕنەوە: پێغەمبەری خۆشەویست وتاری لە سەر مینبەر دارخورما دەخوێندەوە، دوایی لەپاشاندا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : دەمەوێ مینبەرێکم بۆ دروست بکەن، بۆ ئەوەی وتاری لەسەر بخوێنمەوە، پێشەوا بوخاری گوتی : ژنێکی ئەنساری گوتی : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ی خودا ! من مینبەرێکت بۆ دروست دەکەم ، چونکە من بەندەیەکی دارتاشم هەیە . پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بە ئارەزوی خۆت، کاتێ مینبەری بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دروست کرد ، پێغەمبەر (ﷺ) مینبەر لابرد کە پێشتر لەسەری دادەنیشت مینبەر لەدارخورما دروست کرابوو ، مینبەر دەستی بە گریان کردو وەك منداڵی ساوا دەنگی دەهات ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لەباوەشی کردو کپبووەوە.

# بەردو شاخ سڵاویان لەپێغەمبەر کردووە

دەگێڕنەوە : لەپێشەوا علی گوتی: جارێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەمەککە دەرچووین توشی هەر شاخ و بەردێك دەبووین دەیگوت : (السلام علیك یا رسول الله).

# زۆر بوونی خۆراك

دەگێڕنەوە : جارێ أبو طلحة سەیری پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد وا برسیەو بێ هێزە هاتەوە ماڵ بەخێزانەکەی گوت :چیمان هەیە؟ گوتی: کولێرەی جۆ ، گوتی هەستە هەندێ بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ببەو لەناو پەڕۆکێ بیشارەوە ژنە کاتێ چوە لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: طلحة تۆی ڕەوانە کردوە ؟ گوتی : بەڵی، گوتی: بۆ خواردن : گوتی: بەڵێ، گوتی: یاران هەڵسن وەرن ! هەموویان

هاتن. کاتێ ئەو هەفتا هەشتا پیاوە ڕوی لەماڵی طلحة کرد گوتی: ژنەکە ئێمە خواردن بەشی خۆمان ناکات ، بەڵام خوداو پێغەمبەر (ﷺ) شارەزاترن . پێغەمبەر (ﷺ) بە یارانی دەگوت ١٠ کەس ١٠ کەس، خواردن بخۆن، تا هەموویان نانیان خوارد.

## موعجیزەی پێغەمبەر (ﷺ)

دەگێڕنەوە لە (فاطمة)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) جارێ دەگریا ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوە بۆ ؟ گوتی گوێم لەکافرەکان بوو دەیانگوت سوێندمان : بە لات و عوزا محمد دەکوژین ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەندێ ئاو بهێنە دەست نوێژی شۆردو بەتەنها چووەناوکەعبە، کافرەکان دیتیان ویستییان بیکوژن بەڵام هەموویان سەریان شۆڕکردەوەو چاویان نوقاند، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (شاهت الوجوه).

## شمشێری عکاشە

دەگێڕنەوە : لەجەنگی بەدردا (عکاشە) شمشێرێکی لەدەستدابوو، ئەوەندەی شەڕی پێکرد ، تاشکا، لەپاشاندا چوەلای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: من شمشێرەکەم شکا !پێغەمبەر (ﷺ) دارێکی دایە دەست، فەرمووی: شەڕ بەئەوەبکە، ئەویش ڕای هەژاند بوە شمشێرێ وەك شمشێری پێشوو، بگرە گەورەتر، بەهێزتر ، لەگەڵ هەموو جەنگێ لەگەڵ خۆی دەبرد ناویان نا شمشێری ((العون)).

## بازنی کیسرا

دەگێڕنەوە : کاتیٚ پێغەمبەر (ﷺ) وأبوبکر کۆچیان کرد کافرەکان کون بەکون لەدوایان دەگەڕان، لەم دەمودەستە سراقەی مالیك توشی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، هێشتا موسلمان نەبووبوو،پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی سراقە دەتەویٚ بازنی کیسرا لەدەست بکەی، ئەویش پێی سەیر بوو گوتی : کیسرای هورمز پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەڵیٚ، ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە لەسەردەمی پێشەوا عمر بەفەرمانی پێشەوا عمر بازنی کیسرا درا سوراقە وعمر فەرمووی : برۆ بەدەنگی بەرز بڵیٚ: خوداو پێغەمبەر (ﷺ) ڕاست دەکەن .

## گفتوگۆی وابسەی أسدی

دەگێڕنەوە : لەپێشەوا (أحمد) پیاویٚ هەبوو بەناوی ((وابصەی أسدی)) گوتی : لەدڵی خۆم دا بڕیارم دا، بچمە لای پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری چاکەو خراپەی لیٚبکەم، کاتیٚ چومەشوێنەکە قەرەبارغ بوو، منیش هەنگاوم نا خەلکەکە گوتیان لەجێی خۆت دابنیشە گوتم : من دەمەویٚ بچمە نزیك پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) گوتی : لێی بگەرێن نزیك بەوە دووجار، یا سیٚ جار ئاوای گوت لەپاشان دا گوتی : پێت بڵێم یاپرسیارم لیٚدەکەی ؟؟ منیش وتم پێم بڵیٚ گوتی : تۆ بۆ پرسیاری چاکەو خراپە هاتوویتی گوتم: بەڵی، پەنجەی لەسەر سینەم داناو گووتی : سیٚ جار هەست لەدەروونی خۆتو دڵت ڕابگرە چاکە ئەوەیە: کەدڵ پیٚی ئارام ببیٚ، تاوان ئەوەیە لێی دوو دڵ بیت .

## موسڵمان بوونی عتاب حارس

دەگێڕنەوە لە إبن هشام گوتی : لەئەو ساڵەی کەمەککە گیرا، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ بلال چوونە ناو کەعبە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە(بیلال) کرد بانگ بدا، لەئەو دەم (عتابی أسدی) و (حارسی هیشام) و (أبو سوفیانی حەرب) لەنێو کەعبەدابوون. عتاب گوتی: خودا ڕێزی باوکمی گرت، باوکم گوێی لەدەنگی بیلال نەبوو، حارسی هیشام گوتی :ئەگەر بزانم ئەو بانگەوازە ڕاستەو هەقە من بەدوای دەکەوم، أبوسفیان گوتی: من هیچ نالێم هەرشتێ بڵێم ئەو بەردانە شایەتیم لەسەر دەدەن لەلای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لایان گوتی: هەرسێکتان ئەوهاو ئاوهاتان گوت: یەکسەر (عتاب) و(حارس) گووتیان: أشهد ان لااله الا الله واشهد ان محمد رسول الله) گوتیان تۆ پێغەمبەری، بەخودا لەخۆمان زیاتر کەسێك ئاگاداری ئەو قسانە نەبوو!

## گفتوگۆی پێغەمبەر (ﷺ) وفاطمەی کچی

دەگێڕنەوە لە (بوخاری) گوتی: (فاطمە) وەك ڕۆیشتنی پێغەمبەر (ﷺ)،دەڕۆیشت پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردەلای خۆیو بەخێرهاتنی کردو لەلای ڕاستی خۆی دانا، یا لەلای چەپی، لەپاش دا هەندێ قسەی نهێنی لەگەڵ کردو (فاطمە) گریا. عائشة دەڵێ گوتم : بۆ چی دەگریێت ؟ لەپاشان دا پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ قسەی تری لەگەڵ کرد ئەم جارەیان پێکەنی، عائیشە دەڵێ پرسیارم لە فاطمە کرد ئەم گریانو پێکەنینە چیی بوو ؟گوتی من نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکراناکەم تامەرگی خودا بەجێنەهێنێ، ئینجا لەپاش ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) مەرگی خودای بەجێهێنا عائیشە پرسیارەکەی لە فاطمە کردەوە فاطمە گوتی :

گریانەکەم لەبەرئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) گوتی : کچم، جبریل هەموو ساڵێ یەك جار قورئانی بۆ دەخوێندمەوە، بەڵام ئەم ساڵ دووجار خویندیەوە ئەوەش نیشانەی نزیك بونەوەی مەرگمە بۆیە:من گریام، دووهەم بۆیە پێکەنیم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :کچم مەگریە ڕازی نابی کەوا یەکەمین کەس بی لەدوا ڕۆژدا پیم بگەیتو ببیە گەورەی ژنانی بەهەشت یا ژنانی بڕوا داران بۆیە پێکەنیم [٦٢].

## موعجیرەی تر

یەکێك لەموعجیزە هەرە گەورەکان قورئانە، هەروەها لە تبوونی مانگ، بێباوەڕانی قوریش داوایان لە پێغەمبەر (ﷺ)کرد، کە موعجیزەیەکیان پێشانبدا، ئەویش داوای لەخوداکردو،خوداش مانگی بۆ کردە دوو لەت، لەتێك لەسەرووی کێوی ابو قبیس، لەتەکەی تر لەخوارووی کێوەکە جەماوەری دوورو نزیك ڕوداوی لەتبونی مانگی دی، تا ئاوابوو، مانگیش چوار دەی مانگ بوو باوەڕداران بەم کارەساتە باوەڕیان زۆر بوو، بێباوەڕانیش گوتیان ئەمە چ جادوبازێکە. لەگێرانەوەیەکی تردا لەتێکی مانگ کەوتە خۆرهەلات، لەتەکەی تر کەوتە خۆر ئاوا. (الحلبی) دەڵێ: بۆی هەیە مەبەستی پێی خۆرئاواوخۆرهەلاتی کێوەکە بێت، ئەوەش نابێتە لاوازی ئەم قسەیەی کەلەپێشدا ئاماژەم بۆ کرد. لەتبوونی مانگ لەساڵی نۆهەمی پێغەمبەرایەتی بوو، لەتبوونی مانگ لەدوای موعجیزەی قورئانە لەپلەو پایەیدا. هەروا لەتبوونی سینەی پێغەمبەر (ﷺ) هەروەها هەوڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەبێباوەڕان لەبارەی بیت المقدس وەلەئەو بەیانیە کە لەشەوڕۆکەی هاتەوە کەچی لەپێشدا پێغەمبەر (ﷺ) (بیت المقدس) ی نەدیبوو (جبریل) وێنەی (القدس) ی هێنایە بەر چاوی پێغەمبەر (ﷺ)، تاکو پێغەمبەر (ﷺ) باسی قودسیان بۆ بکات گێرانەوەی قافلەی بازرگانی لەفیسار ڕۆژدا دەگاتە شارو گەڕانەوەی خۆر بۆ ئەوەی پێشەوا عەلی نوێژی (العصر) لەدەست نەڕواتن، کەچی

خۆر ئاواش بوو، بەڵام بەنزای پێغەمبەر (ﷺ) خۆر گەڕایەوە هەروەك لەمەولا ئەم باسە دێت ، بێباوەڕان بەرەو رووی پێغەمبەر (ﷺ) هاتن، پێغەمبەریش هەندێك گلی بەرەو روویاندا کردو لەخودا بەزێدەبێت پێغەمبەریان نەدیت، لەڕۆژی حنین، پێغەمبەر (ﷺ) گۆلمێك گلی هاوێشتە بێباوەڕان، خودا لەشکری ئەوانی شکاند.

هەروا جالجالۆکە تەونی لەبەردەم ئەشکەوت کرد، جوتێك کۆتری کێوی وەستا، درەختێك لەئەویٚ ، ئەمەش لەکاتی کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بوو.

ئەو موعجیزانەی سراقەی مالك بینی، زۆربوونی شیری مەڕی دایکی معبد، لەڕێگەی کۆچی پێغەمبەر، نزای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ (عمری الخطاب) کە خودا بەنزای پێغەمبەر (ﷺ) عمری کردە موسلمان. هەروا نزای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ پێشەوا علی لە خودا ساردیو گەرمی لەسەری لابرد بوو، بەجۆرێك پۆشینەی زستانەی لەهاوینان دەپۆشی، پۆشینەی زستانەشی لەهاوینان دەپۆشی، بێئەوەی کاری تێبکات!. پێغەمبەر (ﷺ) نزای بۆ عبدالله ی عباس کرد، خودا شارەزای بکات لەقورئانو ئایین نزاکەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دی . نزای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ وشترەکەی (جابر) هێواش دەڕۆیشت بەنزای پێغەمبەر (ﷺ) بووە خۆشڕەو. نزای پێغەمبەرمان بۆ (أنسی مالك) کەخودا تەمەنی درێژ بکات، سامانی زۆر بکات، منداڵی زۆر بن، ئەوەبوو أنس سەد ساڵ ژیاو سامانی زۆر بوو نەمرد، تا سەد کوڕی دیت لەپشتی خۆی. هەروا نزای پێغەمبەرمان بۆ باخەکەی (جابر) کەقەردی دایەوەو سیانزە وسقیش زێدەی کرد.

نزای پێغەمبەرمان لەکوڕی (أبولهب) کەبکەوێتە دەمی سەگەوە، ئەوەبوو شێر کوشتنی. نزای پێغەمبەر (ﷺ) لە (عامر) کەخودا گیرۆدەی دەردێکی بکات ، ئەوە بوو بەتاعون مرد، نزای پێغەمبەر (ﷺ) لەئەو پیاوەی، کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی گوت: بەدەست ڕاستەت بخۆ! پیاوەکە قسەی پێغەمبەری شکاند، لەسەر ئەمە دەستی پیاوەکە بەرز نەبۆوە بۆ نێو دەمی.

پێغەمبەر (ﷺ) داخوازی ژنێکی کرد، باوی ژنە گوتی: بەلەکە، کەچی وانەبوو یەکسەر ژنەکە بەلەك بوو، تامرد هەر ڕادەچڵەکی. بزن مشكو گورگ شایەتی پێغەمبەریەتیان بۆ داوە. درەخت گەواهی پێغەمبەرایەتی بۆ داوە ، هەروا بانگی درەختی کردووە لەکاتی پێشاو بۆ ئەوەی پەنای لێبکات، درەخت بەدەم بانگی پێغەمبەرەوە هاتووە، سایەی لێکردووە لەبەر گەرمی، دارو درەخت سڵاویان لە پێغەمبەر (ﷺ) کردووە.

پێغەمبەر (ﷺ) لەئەوکاتە دەگەڵ پێشەوا ابوبکرو عمرو عثمان چوونە سەر کێوی (أحد) کێوەکە ڕاچڵەکی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی (أحد) بوەستە تۆ پێغەمبەرێكو ڕاستگۆیەكو دووشەهیدت لەسەر وەستاوە. ناڵەی ئەو کورسیەی کە وتاری لەسەر دەخوێندەوە کاتێ لای برد کورسیەکی تری بۆ دروست کرا بوو!!!

ئامین گوتنی دارو دیوار بەدوای پێغەمبەر (ﷺ) ەوە. وشترەکە بۆ سکاڵا هاتە لای پێغەمبەرو گوتی ئالیکم کەمە، کاری قورسم پێدەکەن.

سکاڵای باڵندە بۆ لای پێغەمبەر، گوتیان هێلکەمان بردراوە ، پێغەمبەر (ﷺ) هێلکەی بۆ گەڕاندەوە ، هوردە بەرد لەدەستی پێغەمبەر (ﷺ) سبحان الله ی کردووە، خۆراك لە لەپیەوە سبحان الله ی کردووە. ئاو لەکەلێنی پەنجەی پێغەمبەر (ﷺ) دەرچووە، بەچەشنێك سوپایەکی مەزن تێر ئاو بوون. بگرە وشترەکانیانو ئەسپەکانیانو قاپو قاچاغیان هەمووی پڕ لەئاوی کەلینی پەنجەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو! ئەمەش چەند جار ڕویداوە، لەجەنگی خەندەق یەك ڕبە جۆ بەشی هەزار هاوەڵی جەنگاوەری کرد. سوپای مەزن بەکەمێك خۆراك تێربووە!!!

بەڵێ زۆر جار خۆراکی کەم بەنزای پێغەمبەر زۆر بووە. بەنزای پێغەمبەر چاوی قتادە چاك بۆوە بگرە خودا جوانترین چاوی پێدا، نزای پێغەمبەر بۆ ژانی چاوی پێشەوا علی لەجەنگی خەندەق کە جارێکی گێرۆدەی ژانی چاو نەبوو ، هەروا نزای پێغەمبەر (ﷺ)، بۆ ڕووخساری (ابوقتادە) کەتیری پێکەوتبوو دەگەڵ

نزای پێغەمبەر (ﷺ)، جێی برینەکە نەما دەتگوت چی بەسەر نەهاتووە!!!

نزای پێغەمبەر بۆ قاچی (سلمە) کەشمشێری پێکەوتبوو یەکسەر چاك بۆوە.

نزای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ سەروقاچی (زیدی معاذ) کە شمشێری پێکەوتبوو، یەکسەر چاك بۆوە. نزای پێغەمبەرمان بۆ دەستی (معاذي عفراء) کە قوتکرابوو دەستی پێك وەنوسا. نزای پێغەمبەرمان، بۆ شان‌وملی خبیب کەلایەکی لار بوو، بە نزای پێغەمبەر (ﷺ) راست بۆوە.

نزای پێغەمبەر بۆ ئەو پیاوەی چاوی توشی ئاوی سپی بوو، کوێر بوو، بە نزای پێغەمبەرمان چاوی چاك بۆوە، لەتەمەنی هەشتا ساڵی داوی بەدەرزیەوە دەکرد.

بەنزای پێغەمبەر ئاوی بیر زۆر بووەو لەتاڵیەوە بۆتە شیرناو، ئەمەش بەهۆی پێغەمبەر (ﷺ) و تف ڕووکردنەناوی. هەروەها بەنزای پێغەمبەر، دەستی بەسەری کەچەڵدا هێنا سەری چاك بۆوە، هەروا بەنزای پێغەمبەر (ﷺ) قاچی شکاوی عبداللە چاك بۆوە، دەتگوت هەرگیز نەشکاوە، هەروا بەدوعای پێغەمبەر بۆنی باپیری عوتبە خۆشبوو بێئەوەی بۆن لەخۆی بدات.

لەڕۆژی گرتنی (مەککە)دا بتەکانی ناو (کەعبە) بەروویاندا کەوتن‌و پێغەمبەر (ﷺ) یش هەرتەنها سەیری کرد بوون‌و ئەم ئایەتەی بەسەردا دەخوێند.

لەڕۆژی جەنگی بەدر پێغەمبەر (ﷺ) شورێکی دابەدەستی عکاشە، لەدەستەکانی بوو بە شمشێرو جەنگی پێکرد هەر لەلاشی ماوە، بەڵێ ئەم موعجیزەی عکاشە بۆ عبداللە ش هاتە دی لەجەنگی بەدر. هەروا بەنزای پێغەمبەر (ﷺ) کچی پیاوێك زیندوو بۆوە، پێغەمبەرمان بەکچەکەی گوت: پێت خۆشە بگەڕێیتەوە جیهان ؟ کچەکە گوتی: نەء، چونکە خودام دی چاکترە لەباوانم، ڕۆژی پەسلانیش خۆشترە لەجیهان، هەروا بەنزای پێغەمبەر (ﷺ) باوانی زیندووبوونەوەو باوەڕیان پێی هێنا.

بەنزای پێغەمبەر چەندەها نەخۆش چاك بوونەتەوە ، بەنزای پێغەمبەر هەفتەیەك بارانباری ونەسایەوە، تا سکالاّیان بردە بەر پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) پاڕایەوەو بارانەکە وەستا.

دەرچونی جێی پێی پێغەمبەر لەهەندێك بەردو دەرنەچوونی جێی پێی لەهەندێك گوتیانە، ئەم موعجیزەیە لەو شەوە بوو، کە پێغەمبەرمان چوّتە ئەشکەوتەکە. پێغەمبەرمان هەواڵی بێباوەڕەکانی باس کرد لەجەنگی بەدر.

پێغەمبەر هەواڵیدا کەوا چینیٚ لەئومەتی ئەو جەنگی دەریایی دەکەن، ام حرامیش دەگەڵیانە ، هەروا مەرگی نجاشی زانی نوێژیشی بۆ کرد، واتا نوێژی تەرم دەگەڵ هاوەلاّنی .

پێغەمبەر هەواڵی کوشتنی أسودی زانی، کەچی ئەو پیاوە لە صنعاء دەژیا. شەوی کوشتنی و کێ کوشتیەتی هەمووی زانی، پێغەمبەر هەواڵی کوشتنی کیسرىی زانی شەوی کوشتنیشی دیار کرد.

هەروا پێغەمبەر (ﷺ) بەثابتی گوت: بەسوپاسگوزاریەوە دەژیتو بەشەهیدی دەمریت ، ئەوە بوو لەجەنگی یەمامە لەسەردەمی أبوبکری الصدیق دەگەڵ جەنگی مسیلمة الکذاب شەهید بوو.

پێغەمبەر بەپێشەوا حسنی گوت ئەمە ڕۆڵەی منەو سەیدە بەهۆی ئەمەوە خودا مەسرەتی دەخاتە نێوان دوو دەستەی موسلمانانەوە.

هەروا پێغەمبەر هەواڵی دایە پێشەوا (عثمان) گیرۆدەی ناخۆشی دەبێت، هەتا جارێك پێی گوت شەهید.

هەروا پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دا پێشەوا عمر شەهید دەبێت، ئەوەبوو بەدەستی (ابو لؤلؤة) شەهید بوو ئەم بکوژە بەندەی (المغیرە) بوو پێغەمبەر بەزبیری گوت، تۆ دەبیتە ستەمکار دەرهەق بەپێشەوا علی، ئەوەبوو لەڕووداوی (الجمل) ئەم قسەیەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتەدیو (زبیروطلحە وعائشە) دەرچوونو داوای خوێنی پێشەوا عثمانیان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) بەعماری گوت دەستەیەکی یاخی

دەتکوژن، ئـەوەبوو لەکارەسـاتی صـفین کـوژرا. پێغەمبـەرمان (ﷺ) بەپێـشەوا علـی فەرمووخراپترین کەس دوانن،ئەوەی وشترەکەی کوشت، ئەوەی تۆ دەکوژێ.[٦٣]

## چەکەکانی پێغەمبەر(ﷺ):

### یەکەم/ شمشێرەکانی پێغەمبەرمان(ﷺ)

١- المأثور: پێغەمبـەر (ﷺ) ئەمـەی لەباوکیـەوە بـۆ ماوەتـەوە. ٢- ذو الفقار: پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی لەجەنگی بەدر بەدەستکەوت. ٣- الرّسوب: پێغەمبەر ئەمەی لەسەر بتی هۆزی طي بەدەستکەوت. ٤- القلعي: لەچەکەکانی بنی قینقاع بوو. ٥- الغیـزم. ٦- القـضیب: یەکـەمین شمـشێرە پێغەمبـەر (ﷺ) هـەڵی گرتبێـت ٧- العضب: سعدی عبادة پێیدا. ٨- الصمامة: شمشێری عمری معدی کرب بوو. ٩- الحتیف: لەچەکەکانی بنی قینقاع بوو. ١٠- المتار: لەچەکەکانی بنی قینقاع بوو.

### دووەم/ کراسە زرێیەکانی پێغبەمبەر(ﷺ)

١- السعدیة

٢- ذات الحواشی

٣- ذات الفضول

٤- الخیر نق

٥- البترا

٦- فضة

٧- ذات الوشاع

تێبینی (٥، ٦، ٧) وەرگیراوە لەپەرتووکی الشجرة المحمدیة.

### سێهەم/ رمەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- المثنی. ٢- الموثوی. ٣- هـەروا سێ رمـی دی هـەبووە، کەلـەبنی قینقـاعی وەرگرتبوو کەواتە ژمارەی سەرجەم رمەکانی پێنجم.

### چوارەم/ کڵاوە جەنگیەکانی پێغەمبەر(ﷺ)

١- الصبوغ. ٢- موشيح[٦٤]

**پێنجەم/ قەڵغانەکانی پێغەمبەر(ﷺ):**

١- الفتق. ٢- الزلوق. ٣- الموخر.

**شەشەم/ کەوانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)**

١- البيضاء. ٢- الروحاء. ٣- الصفراء ٤- الزورا. ٥- السداد. ٦- كتوم. ( بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە دەنگی نزم بووە).

**هەفتەم / ئالاو بەیداخی پێغەمبەر(ﷺ)**

١- العقاب رەنگی رەش و چوار گۆشەیی بوو.

٢- الصفراءئەمەش قسەی ابو داودە. ٣- الزينة رەنگی سپی بووە.

**هەشتەم/ مەڕو ماڵاتو وڵاخوو پەزی پێغەمبەر(ﷺ)**

پێغەمبەری خۆشەویست سەد سەر پەزی هەبوو واتا: مەڕ، دەگەڵ هەفت بزن. مەڕێکی هەبوو تەنها شیری ئەوی دەخوارد ناوی (غيشة) بوو. هەروا پشیلەش هەبوو، لەماڵی پێغەمبەر(ﷺ) هەروا کەڵەشێر. هەروا هەفت چێڵی هەبووە، گاوانەکەی ناوی هزی أم ايمن بووە.

**نۆیەم/ ئەسپەکانی پێغەمبەر(ﷺ):**

١- سكب: لەعەرەبێکی کڕیبوو. ٢- لزاز: پادشا المقوقس بەدیاری بۆی ڕەوانەکرد. ٣- الظرب: ابن ابی البرا بەدیاری پێیدا. ٤- اللحيف: فروة بەدیاری پێیدا. ٥- السداد: ٦- الورد: تميم بەیداری پێیدا. ٧- سبحة. ٨- الابلق. ٩- ذو العقاب. ١٠- ذو اللمة. ١١- المرتجل. ١٢- السرحان. ١٣- اليعسوب. ١٤- البحر.

١٥- الادهم. ١٦- المراوح. ١٧- النجيب ١٨- الطرق.

**دەیەم/ گوێدرێژەکانی پێغەمبەر(ﷺ):**

١- یعفور بوو. ٢- عفیر . ٣- جزامی.

**یانزدەهەم/ هێسترەکانی پێغەمبەر(ﷺ):**

١- الشهباء: پادشا المقوقس بەدیاری پێیدا.

٢- الدلدل: هەندێك ئێژن الشهبا- و - الدلدل، هەر یەکن. ئەمە یەکەمین هێسترە پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش بوونە پێغەمبەر(ﷺ) پای نابێتەسەر. ٣- فضة: فروە بەدیاری پێیدا هەندێك دەڵێن ابوبکر پێیداوە. ٤- هێستری چوارەم سەرکاریّ (الیة) بەپێغەمبەری (ﷺ) بەخشی . ٥- هێستری پێنجەم پادشا النجاشی پێی بەخشی. ٦- هێستری شەشەم کسری پێی بەخشی، کەچی قسەی دروست ئەوەیە کسری هێستری بەپێغەمبەر(ﷺ) نەبەخشیوە[٦٥] .

**دوازدەم/ وشترەکانی پێغەمبەر(ﷺ):**

١-إیتلال. ٢- إیتراف. ٣- برودة. ٤- حنا. ٥- السعدیة. ٦- السُقیا. ٧- زمزم[٦٦].

**سێزدەهەم: جلو پۆشینەو کەلوپەلی پێغەمبەر(ﷺ):**

خوێنەری هێژا: پێغەمبەر(ﷺ) (دوو) جووت کاڵە و(یەك) سۆڵەی هەبووە. (دوو) مێزەری هەبووە، رەنگ رەش و سپی لەرۆژەی مکە فتح کرا مێزەرە رەشەکەی لەسەری بوو. هەندێك ئێژن: (چوار) مێزەری هەبووە یەکێك لەمێزەرەکان ناوی السحاری بوو. و(دوو) کراسی حیبەرە و (سێ) جبە و(یەك) شاڵی و(یەك) یەك قسعە (قاپی نانخواردن(دوو) نوێنی قەدیفەو(یەك) ربەبۆزەکات دەرکردن. (یەك) کورسی و (یەك) تەشت و(یەك) کڵاوی بچووك و (یەك) شەروالی عمانی و(دوو) چاکەت و هەروا

پێغەمبەر تەوورەگەیەکی هەبوو سیواك و کلدان و ئاوێنەو شانەو مقەسی لەناو دادەنا، پێی دەگوترا تەوورەگەی (اسکندرانیة) پادشا المقوقس بەدیاری بۆی رەوانەکردبوو.

هەروا (یەك) کوندە بۆئاو خواردنەوەو (یەك) چەقۆو (یەك) مەنجەڵ (یەك) دەست شۆری سفرو (یەك) پەشتە ماڵو(یەك) قاپ بۆ خەنەگرتنەوە، چونکە پێغەمبەرمان لەبەر ژانەسەر، زۆر خەنەی لەسەری دەنا.

هەروا (یەك) ئەموستیلەی هەبوو لەزیو بوو، هەندێك ئێژن ئەموستیلەکی دی هەبووە لەئاسن لەسەر ئەموستیلەکە نەخشی محمد رسول الله بەئەم چەشنەی خوارەوە نوسرابوو (الله محمد رسول).

هەروا قاپێکی هەبوو واتا قوتوێك بۆ میزکردن تیایدا لەشەواندا. هەروا دارو چکەیەکی هەبوو لەجەژنەکاندا بەدەستەتیەوە دەیگرت و لەکاتی نوێژ لەپێش خۆی دەچەقاند[٦٧]. دۆستی سەنگین! ئەگەر بێت و چاوت بخەیتە نێوان مشتی راستییەوە، ئەوا بۆت ئاشکراو والاّ دەبێت تۆ لەئەوپەڕی گوزەرانی شادیدا دەژیت، خانووبەرەی بەرزو بلندمان، خواردن و خواردنەوەی هەمە رەنگمان، پێخەف و نوێنی بێئەژمارمان، ئای و ئۆف سەیرین، هەرخودا دەزانی چیمان لەماڵدا داناوە چەندامان بەڕادان داوە خەیالی چەندەها کەلوپەلی هەمەڕەنگ لەمێشکماندا هاتو چۆدەکات! بەلێ ئەمە ماڵی پێغەمبەری خودا بوو، ماڵی خۆشەویستی خودا بوو، ماڵێك نەبووەو نیەو نابێ لەلای خوداوە لەئەم ماڵە بەنازو خۆشەویست تربێت، کەچی سەرباری ئەمانەش جاری واهەبوو لەماوەی دوو مانگان ئاگر لەماڵەکەیدا دانەگیرساوە!.

## هاوەڵان و خانەوادەی پێغەمبەر (ﷺ):

### خاڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

١- عبد یغوث کوڕی وهب کوڕی مناف کوڕی زهرة کوڕی حکیم. ئەم عبد یغوثة برای ئامینە خانی دایکی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، دایکی ناوی صفیەی هاشمی عبد مناف بوو، کوڕی قصی کوڕی حکیم کوڕی مره کوڕی کعب کوڕی لؤي.

٢- الاسود بن وهب

### برایەکانی شیری پێغەمبەر (ﷺ):

١- مسروح کەدایکی کەنیزەیەکی (ابو لهب) ی مامی پێغەمبەر (ﷺ) بوو ناوی (ثویبیة) بوو.

٢- حمزة بن عبدالمطلب مامی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، ئەمەش (ثویبیة) دایکی شیری بوو لەپێغەمبەر (ﷺ)گەورەتربوو.

٣- ابو سلمه بن عبدالآسدالمخزومی، (ام سلمەی) خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) ژنی ئەو بوو، ثویبة شیری پێدابوو دەگەل حمزەی مامی پێغەمبەر (ﷺ) چوار ساڵ لەپێش پێغەمبەر (ﷺ) .

٤- عبدالله ی الحرث بن عبدالعزی دایکی حلیمەی ذویب ی السعدیة[٦٨].

## مامەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

اما اعمامه (ﷺ) اثناعشر: حمزەوالعباس وهماالمسلمان وأبوطالب والصحیح انه مات کافرا واسمه عبدمناف وابو لهب اسمه عبدالعزی والحرث والزبیر وجحل ویسمی المغیرة وعبدالکعبة وقثیم وضرار والغیداق واسمه مصعب وقیل نوفل والمقوم.ومن الناس من یعد هم عشرة: ویجعل عبدالکعبة والمقوم واحدا وجحلا والغیداق واحدا. مامەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دوانزەن.

١-حمزە:مامی وبرای شیری پێغەمبەر (ﷺ) بوو، پێغەمبەر نازناوی ((أسدُالله)) بۆ

دانـاوە، هـەروا((سـید الـشهداء))بەدەسـتی وەحـشی شـەهید بـوو ٨٠ وهەنـدێك شمشێری لێدرا.

٢- العباس موسلمان بوو.

٣- ابو طالب :قسەی دروست ئەوەیە بەبێباوەڕی مرد.ناوی تەواوی أبوطالب ((عبد مناف)) بوو مامی هەقی پێغەمبەر (ﷺ) بوو.

٤-أبولهب ناوی تەواوی عبدالعزی یوو... بەبێباوەری مرد

٥- الحـرث: لەهـەموویان بەتەمـەنترە، لـەپێش پێغەمبەرایـەتی مـرد، چـوار منـداڵی موسلمان بوو.نوفل= ربیعة= ابوسـفیان ﷺ عبدالله ابن عبدالبر ئێژن پێنـج بوون المغیره زیادکردووە. نوفل لەبراکـانی گەورەتربوو، هەروا لەکوڕانی هاشم.

٦-الزبیر:مامی هەقی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، ئەم مندالانەی هەبوو عبدالله ،ضباعة، صفیة، ام الحکم ،ام الزبیر هەموویان موسلمان بوون.

٧-جحل ناوی المغیرەش بوو منداڵی بۆ نەما

٨- عبدالکعبة مامی هەقی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، بە پێغەمبەرایەتی نەگەیشتو وجاخ کوێر بوو

٩- قثم لەمنداڵیدا مرد

١٠-ضرار: لەسەردەمی سروش مرد ،موسوڵمان نەبوو لاوێکی نانبدەو جوانبوو

١١- الغیداق ناوی مصعب بووە، هەندێك ئێژن (نوفل) بوو، لەهەموو قوڕەیشیەکان دەوڵەمەند تر بوو، بۆیە ئەم نازناوەی لێنراوە .

١٢- المقوم: ئەمەش منداڵی بۆ نەژیاو وجاخ کوێر بوو.

هەندێك لەزانایان ژمارەی مامەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە (١٠) مام دادەنێن ئێژن (عبدالکعبة) (المقوم) هەریەکن . هەروا جحل والغیدا قیش هەر یەکن[٦٩].

## پوورەكانی پێغەمبەر (ﷺ) مان لەباوكیەوە :

١- (صفية) ئاشكرایە كە موسوڵمان بووە. دایكی زبیری العوامة دایكی هالة اهیب بوو واتا دەگەڵ حمزه والمقوم جحل خوشك و برای هەقن، پیاوەكەی (العوامی خویلد) بوو، واتا برای خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) . لەپێش العوام ضنی الحرث ی كچێكی لێبوو بەناوی صفیە لەسەردەمی پێشەوا عمر مرد لەساڵی (٢٠) ی كۆچەری هەندێك ئێژن لەپوورانی پێغەمبەر (ﷺ) هەر ئەوە موسوڵمان بوو هەندێكیش ئێژن اروی و عاتكەش

٢- (اروی): كێشە هەیە لەسەر موسوڵمان بوونی، هەندێك ئێژن: دایكی ناوی فاطمەی عمری عائذ بووە واتا خوشكی هەقی دەگەڵ عبداللە ی بابی پێغەمبەر (ﷺ) و ابا طالب، هەندێكیش ئێژن دایكی ناوی صفیة جند بووە، واتا خوشكی هەقی الحرث وقثم . ئەم ژنە شووی كرد بەعمیری وهب یەكێك بوو لەكۆچەرە سەرەتاییەكان و بەشدار بووانی بەدر، كۆچی كرد بۆ حەبەشەو شەهیدكرا وجاخ كوێر بوو لە دواتر أروی شووی بە كلدة هاشم كردو فاطمەی بوو.

٣- (عاتكه): كێشە هەیە لەسەرموسوڵمان بوونی . خێزانی امیة المغیرة بوو، ئەم منداڵانەی هەبوو: عبداللە – زهیر – قریبة الكبری .

٤-(ام حكیم): موسوڵمان نەبووە . نازناوی البیضاش ی پێدەڵێن كچی عبد المطلبی هاشم .

٥- (برة) موسوڵمان نەبووە، كچی عبد المطلب ی هاشم . برة وعبد اللە ی باوكی پێغەمبەر (ﷺ) و ابوطالب وزبیر لەیەك دایك و باوكن . برا ژنی عبد الاسدی هلالی عبد اللەی عمری مخزوم بوو . اباسلمەی هێنا.

٦- (امیة): موسوڵمان نەبو و پیاوەكەی جحشی ریاب بوو، ئەوكوڕانەی هەبوو عبداللە لەجەنگی (أحد) شەهید بوو (ابا احمد) كوێر بوو ، پیاوێكی شیعر زان

بوو ناوی تەواوی عبد بوو کۆچی کردبۆ مدینە . (عبیداللە) موسوڵمان بوو کۆچی کرد بۆحەبەشە دواتر کافر بوو.

کچەکانی، (زینب) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) لەپێشتر ژنی (زیدی حارث) بوو، (جیبە) خێزانی عبد الرحمانی عوف بوو[٧٠].

## واتای فرەژنی پێغەمبەر(ﷺ):

خوێنەری هێژا ! موحەممەد (ﷺ) دوایین پێغەمبەرە (ﷺ) ئایینی ئیسلام دوایین ئاینە، هەر کەسێك بەئەم پێغەمبەرەو(ﷺ) ئایینە قایل نەبێ، ئەوە قوڕ بەسەرو بێباوەڕە، ئەگەر چی پێغەمبەر (ﷺ) ژنی زۆر هێناوە، بەڵام ئەمە نابێتە بەڵگە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم کارەی لەخۆیەوە کردبێت، چونکە خودا فەرموویەتی (وما ینطق عن الهوی ) کەواتە ژن هێنان گفتو گۆی تیادایە، ئەگەر کەسێك لەژنێکەوە بەسەرەوە بخوازێت، ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) و ئایینەکەی چەند هەڵو مەرجەێکی سەرەکیان داناوە بۆ ئەو پیاوەی دوو ژن زێتر دەهێنێت، هەروا پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیزاو هەرگیز دەستی بەدەستی ژنی بیانی نەکەوتووە" بگرە لەئەمەش بەهێز تر، عائشە فەرموویەتی من لەگەڵ

پێغەمبەر (ﷺ) دامەنی ئەوم نەدیوە! بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) بەئابڕووترین کەس بووە ، خاوێن ترین داوێنی هەبووە ئەم ژنانەی ئەو هێناویەتی هەر هەموویان بێوەژن بوونە تەمەنیان گەورە بووە، تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) گەورە بووە، تەنها عائشە کچ بووە. چۆن پێغەمبەرایەتی دەگونجێ کاری ناشا یستەی لێ بێتە دی . باسی فرە ژنی باسێکی فرە درێژە پڕ لەپەلو پۆیە، بۆ نمونە لەئایینی جولەکەو دیانەکان فرە ژنی باو بوو ، بەڵام قەشەکانی کەنیسە لەپاش کۆبونەوەیەکیان لەبارەی فرە ژنی دوا بڕیاری دەستکردی خۆیان بۆ ئەم حوکمە دەرکرد، ئەویش ئەوەبوو کەوا نابێ پیاو لەژنێك زێتر لەلایەوە بێت، هەروا لەدوورگەی عەرەبیش فرە

ژنـی زۆر بـوو. بـەڵی، لەمێـژووی زێڕینـی ئیسلامدا لەساڵی هەشـتەمی کۆچـەری، بڕیارێك هاتە سەر زەوی دوو واتای هەڵدەگرت، یەکێك فرەژنی بۆ کەسێك ژنەکەی توانـای درووستبونی نـەبێ ، یانـەخۆش بـێ ، یـا ژنێکـی خـراپ بـێو خـۆی نەداتـە دەست ، یاپیاوەکە ئارەزووی زۆر بێو باری ئابووری باشبێو بەهۆی ئەمەوە دادی خـودا جێبـەجێ بکـا، ئەمانـە هـەر هـەموویان هـەلو مـەرجی فـرە ژنـین .خـۆ ئەگـەر کابراش توانای دروستبوونی کەمبێو ئابووری کەمبێو دادی خودای پێ جێبەجێ نەکرێتو خانوو جلو بەرگو هاو تەمەن نەبوو دەگەڵ ئەو ژنەی کەدەیخوازێت، ئەمانـە دەبنـە هـۆی ژنهێنـانێکی خـراپ نـەك بـاش . بزانـە ژنـانی پێغەمبـەر (ﷺ) لەهەمان کاتا دەبنە دایکانی باوەڕدار بۆهەر کەسێك کە هاتبێتە ناو ئیسلام، واتا لـەپاش پێغەمبـەر (ﷺ) بۆ هـیچ کەسێك ڕەوانییـە ژنەکانی ئـەو بخوازێـت، ئەمـەش دەبێتە گەورێتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ژنەکانی.

ژنـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) پـیرو بەسـالا چـووبوون ، خـودی پێغەمبـەر (ﷺ) بەسالا چووبوو، بەڵام مەبەستی ئەوە بوو کەوا بەهۆی ئەم ژنو ژن خوازیە هەستی ژنـەکان زامـدار نـەبێت، هـەروەها ئـەم سـەرداریيەو سـۆزەی پێغەمبـەر (ﷺ) بـەکار ئـەنجام بدرێت، مەبەستی پێغەمبـەر (ﷺ) تێکـەڵ بوون بوو دەگـەڵ سـەرکردەکان، وەك (ام حبيبـة) کەکچی (ابو سـفيان) بـوو، واتـا بـاوکی دەم چـەرمۆی بێباوەڕەکـان بوو، هەروا (جويريه) کچی سەرەك هۆزی (المصطلق) بوو، (صفیەی حیيی الخطب) دەم چـەرمۆی جولـەکان بـوو، جـا ئـەم تێکـەڵ بوونـەی پێغەمبـەر (ﷺ) بـوو، بەنمونەیەك لەنمونەکانی سەرکەوتنو بڵاوبونەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەبێ شەڕو بەبێ غەزاو جەنگ.

جـا بـرای بـەڕێز ناچـێتە هۆشـەوە، پێغەمبـەر (ﷺ) نـەفامو ئـارەزوو بـازوو بەکەیفو ماشای خۆیەوە ئەم خەڵکەی ئەو لاوئەولا کردبێت، بەڵگە پێغەمبـەر (ﷺ) پێشەوای بوارێك، پزیشکی هەموو دەردێك بووە

کەواتە ئەومامەڵەی لەنێوان ژنانی منو تۆوە بەندە جیاوازە، چونکە ئەوان قورئان بەدایك ناو زەدی کردوونە ، خێزانی ڕەوانە کراوی خودا بوونە، ڕەوانەکراوێك شەرموو ئابڕووی لەکچێکی تازە هەراش پتربووە[71] !!

## خێزانە گوێزراوەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

### ١- خەدیجە

ناوی خدیجەی کچی خویلدە . یەکەمین خێزانی پێغەمبەرە (ﷺ) ، یەکەمین کەسە باوەڕی بەپێغەمبەر (ﷺ) هێناوە ، منداڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەموویان لەخەدیجە بوون ، جگە لە (ابراهیم) کە لە(ماریەی قبطی) بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی، سامانی خەدیجە زۆر بەکەڵك ئیسلام هاتووە، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گواستەوە تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو ، تەمەنی خەدیجەش (٣٥) ساڵ بوو . ئەم بەڕێزە ٣ ساڵ لەپێش کۆچ، مەرگی خودای بەجێ هێنا، خودای گەورە سلاوی بەجبریل بۆ خدیجە ڕەوانە کردووە .ب .

پێغەمبەر (ﷺ) ژنی بەسەر نەهێناوە ، تامرد خەدیجە خان یەك فەرموودەی لەپێغەمبەر(ﷺ) گێڕاوەتەوە ، دایکی ناوی : فاطمةی زائدە الاعصم بوو .

### ٢- سودە خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)

ناوی سودة زعمەی قیسی ..... تد، ئەم ژنە زۆر بەتەمەن بوو ، پێغەمبەر (ﷺ) خەریك بوو ، تەلاقی بدات ،بەلام ئەو لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) سرەی خۆی دا بە عائشە بۆیە: پێغەمبەر (ﷺ) تەلاقی نەدا چونکە، (سودة) ئەوەندە پێغەمبەر (ﷺ) ی خۆشدەویست پێی خۆشبوو هەر خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) بێ ! پێغەمبەر (ﷺ) سودەی لەساڵی دەهەمی پێغەمبەرایەتی گواستەوە پێشتر خێزانی ئامۆزایەکی خۆی بوو

## ٣- عائشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) :

ناوی عائیشەی کچی (ابوبکری الصدیق): لەنێوهەموو خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ،تەنها (عائشە) کچ بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) گواستیەوە ئەوانی تر بێوەژن بوون.دەگێڕنەوە :گوتیان ئەی پێغەمبەر (ﷺ) کامە خێزانت زۆر خۆش دەوێ گوتی :عائشە گوتیان ئەی لەپیاوان ؟گوتی باوکی .(ب). تەنها لەنۆبەی عائشە پەیام هاتۆتەخوارەوە، زۆر لەهاوەڵەکان لەبارەی ئیسلام پرسیاریان لێ دەکرد، لەنۆبەی ئەودا لەژووری ئەودا پێغەمبەر (ﷺ) مردوە، هەروەها لەژووری ئەودا نێژراوە، لەپێش ئەوەی مارەبکرێ، فریشتە وێنەی عائشەی لەپارچە کوتالێکی هاوریشم بە پێغەمبەر (ﷺ) نیشان دا، پێغەمبەر (ﷺ) کەسەیری کرد زانی وێنەی عائشەیە، دایکی عائشە خان ناوی (رمان عامری عومیر) بوو، مارەییەکەی ٤٠٠ درهەم بوو، نازناوی ام عبدالله بوو، ١٢١٠ فەرموودەی لەپێغەمبەر گێراوەتەوە، ابو هریرە نوێژی مەرگی لەسەر کرد.

## ٤- حفصەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)

ناوی حفصەیە کچی عمر بن خطابە، دایکی ناوی :زینب کچی مظعونة پێغەمبەر (ﷺ) ٣٠ مانگ لەپاش کۆچ ئەم خانمەی گواستەوە، (پێنج ساڵ لەپێش بوونی پێغەمبەر (ﷺ) بە پێغەمبەر (ﷺ) ) لەدایکی بووە، مارەییەکەی ٤٠٠ درهەم بوو ٦٠ فەرموودەی لەپێغەمبەر گێراوەتەوە. لەمانگی شعبانی ساڵی ٤٥ کۆچی مەرگی خودای بەجێ هێناوە. (مروانی الحکم) نوێژی مەرگی لەسەر کرد،ئەو کات فەرمانڕەوای مەدینەبوو. ئەم ژنە لەپێش پێغەمبەر (ﷺ) خێزانی خنیس حذافة بوو کەیەکێك بوو لەو کەسانەی بەشداری جەنگی بەدرو أحدی کردوە . دوایی شەهید بوو، ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) گواستیەوە.

## ٥- زینب-ی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) :

ناوی زینب ی خزیمەی حرث العربیة هلالیة.لەساڵی ٣ کوچی پێغەمبەر (ﷺ) گواستیەوە.مارەیەکەی ٤٠٠ درهەم بوو دوومانگ یان ٣ مانگ لەلای پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە دوایی مرد، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی نوێژی مەرگی لەسەر کرد تەمەنی ٣٠ساڵبوو (جگە لەخدیجەو ئەم زینبەو لەقەولێك ژنێکی ناو ریحانە). نەبێ هیچ ژنێکی پێغەمبەر (ﷺ) لەپێش مەرگی پێغەمبەر (ﷺ) نەمردووە، نازناوی ام المساکین بوو، چونکە خێراتی زۆر دەکرد، لەپێش پێغەمبەر (ﷺ) خێزانی عبدالله ی جحش بوو.

## ٦- ام سلمە خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)

ناوی ام سلمە هند ابی امیە بن المغیرەیە، لەکۆتایی مانگی شەوالی ساڵی ٢ – یا چواری کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ژنەی گواستەوە، بەکوڕەکەی گوت: لەپێغەمبەر مارەم بکە. ئەم قسەیە پێچەوانەی ڕاڕەوی شافعیيە ٣٢٨ فەرموودەی لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاوەتەوە، لەساڵی ٦٠ی کۆچی مەرگی خودای بەجێ هێنا. لەسەردەمی یزیدی معاویە تەمەنی ٨٤ ساڵ بوو، (ابو هریرە) نوێژی مەرگی لەسەر کردووە، لەبەقیع نێژراوە.

## ٧- صفیەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) :

ناوی : صفەیەی حی لەنەتەوەی هارونی عمرانی برای موسی پێغەمبەرە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ژنەی لەسالی ٧ی کۆچی گواستەوە، لەپێش پێغەمبەر (ﷺ) خێزانی (کنانە ابی عقیق) بوو، پێغەمبەر (ﷺ) کوشتی هەندێ فەرموویانە لەساڵی ٣٦یا ٥٠ مەرگی خودای بەجێ هێناوە، دایکی ناوی برە شمول بوو باوکی ئاغای هۆزی بني نضير بوو، کە هۆزێکی جولەکە بوون، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ئازادی

کـردو مارەییەکـەی لـەبری ئـازاد کـردن دابـوو، کـاتێ پێغەمبـەر (ﷺ) گواسـتیەوە تەمـەنی ١٧ سـاڵ بـوو، ژنێکـی شـۆخ و شـەنگ بـوو، ئـەم بـەڕێزە ١٠ فـەرموودەی لـە پێغەمبـەر (ﷺ) گێڕاوەتـەوە لـەمانگی ڕەمـەزان مـردووە، لەبـەقیع نێـژراوەو لەسـاڵی ٥٠یا٣٦ کۆچی.

## ٨- جویریەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)

ناوی : جویریەی حرث ضراري خزاعیة. پێغەمبەر (ﷺ) لە ثابت قیسی کڕیو ئازادی کردو دوایی گواستیەوە، مارەیەکەی ٤٠٠ درهەم. هەندێ فەرموویانە باوکی موسلمان بـووە، پێـنج فـەرموودەی لـە پێغەمبـەر (ﷺ) گێڕاوەتـەوە، لەسـاڵی ٥٦ی کۆچی تەمـەنی ٧٠ سـاڵ بـوو مـەرگی خـودای بـەجێ هێنـاوە (مروانـی حکـم) نوێـژی لەسەر کردووە. لەسایەی ئازاد کردنـی ١٠٠ مۆسـلمان ئـازاد کـران، چـونکە ئـەم ژنـە لەغـەزای (بـنی المـصطلق) گـیرا، کەوتـە بـەر بەشـی (ثابـت قیـسی) پێغەمبـەر (ﷺ) لەئەوی کڕیەوە ئازادی کرد.

## ٩- میمونەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)

ناوی: میمونەی حرث العربیة هلالیة، دایکی خێزانی عوف ی زهیر بووە، نـاوی برە بووە، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نا میمونە ٧٦ فەرموودەی لە پێغەمبـەر (ﷺ) گێڕاوەتەوە لەساڵی ٥١ی کۆچی یا٦٣ی کۆچی مەرگی خودای بەجێهێناوە، تەمەنی ٨٠ سـاڵ بـوو، دوا ژن بـوو کـە پێغەمبـەر (ﷺ) گواسـتیەوە، دوا ژن بـوو لەژنـەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کەمرد. پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرف گواستیەوە، هەر لەئەوێش مرد . سەرف شوێنێکە ٧ میل لەمەککە دوورە، پووری عبدالله ی عباسە.

## ١٠- ام حبیبه خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)

ناوی: ام حبیبه رملە ابو سفیان صخر حرب...هتد دایکی (صفیەی ابی العاصه) . پووری عثمانی مظعون ە لەساڵی ٤٤ کۆچی مەرگی خودای بەجێ هێنا.
\

## ١١- زینەبەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)

ناوی: (زینب ی جحش رباب) دایکی ناوی (امیه) بوو، .پێغەمبەر (ﷺ) لەزیدی حارثه ی مارە کرد، کاتێ زید تەڵاقیدا پێغەمبەر (ﷺ) مارەی کردو گواستیەوە لەتەمەنی ٣٥ساڵیدا، ١٠ فەرموودەی لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاوەتەوە. لەساڵی ٢٠ یا ٢١ی کۆچی لەتەمەنی ٥٣ ساڵیدا مەرگی خودای بەجێ هێناوە، پێشەوا عمر نوێژی مەرگی لەسەر کردووە، لەبقیع نێژراوە.

## ١٢- ماریەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)

پادشای مقوقس ماریەی بەدیاری بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانە کرد، لەگەڵ خوشکێکی بەناوی سیرین. ئەم ژنە لە قبطیـیە کانی مصر بوو، تەنها ابراهیمی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) لەو ژنە بوو. لەسەردەمی پێشەوا عمر لەساڵی ١٦ کۆچی مەرگی خودای بەجێ هێناوە، پێشەوا عمر نوێژی جەنازەی لەسەر کردووە[٧٢].

## خێزانە نەگوێزراوەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- **العالية الكلابية:** کچی ظبيان عمر بن عوف ابن عبد بن ابی بكر بن كلاب بن روى ماوەیەك لەلای پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە دواتر پێغەمبەر (ﷺ) بەڕەڵای کرد لەپاش ڕێز لێنانێکی زۆرەوە.

٢- **شراف الكلبية:** خوشکی دحيه الكلبي بوو، جبریل لەسەر چەشنی دحیەی برای سرووشی بۆ پێغەمبەرمان دەهێنا ئەم ژنە لەناو چوو پێش ئەوەی پێغەمبەرمان بچێتە لای.

٣- **سنا اللیمة كضي الصلت** – حبیب – حازم – هلال، سنا مەرگی سپارد لەپێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بچێتە لای.

٤- **قتيلة الكندية:** کچی معدی کرب کندی خوشکی اشعثی قیس

٥- **عمرة الكلية:** کچی یزید عبیدی اوس، پێغەمبەر (ﷺ) نەچووە لای چونکە نەخۆشی پێست یا گڕوتی (گۆڵی) هەبوو.

٦- **الجوينة الكندية:** کچی اسدی الساعدی بوو عائشە و حفصەو خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕازاندیانەوە، گوتیان پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك دێتە لات پێی خۆ بڵێ اعوذ باللە، ئەویش کە گوێی لەئەمە بوو، هەنگوچکی لەسەر زاری پێغەمبەر (ﷺ) دانا. جا هەندێك لەمێژوو نوسان ئێژن ئەمە، ڕویداوە اسمای خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) بووە.

٧- **ليلى الاوسية**، کچی الخطیم اوس ، لەپشتی پێغەمبەرەوە هات و دەستی لەشانی پێغەمبەر (ﷺ) داو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەمە کێیە شێر دەیخوا، گوتی من لیلىم هاتوومە بم خوازی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوا تۆم وەرگرت و خواست، جائەم ژنە گەڕایەوە ماڵەوەو تمیمی برای گووتی پێغەمبەر (ﷺ) ژنی

زۆرەو دەترسم لێت بڕەنجێ نزات لێبکات، جا ئەم ژنە لەناو مەدینەدا شیر خواردی.

٨- **صفية الغبرية:** کچی بشامە الغبری بوو، بنەماڵەی الغبری تیرەکن لەتمیم پێغەمبەر (ﷺ) گواستیەوەو دواتر ئەم ژنە گەڕانەوەی پەسند کرد، چونکە لەغەزا گیرا بوو.

٩- **ضباعة القشيرية:** خێزانی عبدالله ی جرعان بوو، دوایی شووی بەهشامی المغیرە کرد، لەپاش ئەمە پێغەمبەر (ﷺ) داخوازی کرد، بەڵام کەزانی بەتەمەنە نەیگوازتەوە[٧٣].

## کوڕەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

١- **القاسم:** لەشاری مەککە لەدایك بووە، هەر لەئەوێش گیانی سپاردووە، لەپێش پێغەمبەرایەتی لەدایك بووە، هەندێك ئێژن لەتەمەنی دوو ساڵو چەند مانگێك مردووە، هەندێك ئێژن تەمەنی هەفت ڕۆژ بووە، هەندێك ئێژن هەفت مانگ بووە، هەندێك ئێژن، تا بەسەر پێ نەکەوتووە نەمردووە، دایکی ناوی (خدیجەی خویلد) بوو، هەندێك ئێژن خەدیجە کوڕی ناو قاسمی نەبووە.

ئەم قسەیە هەڵەیە کە دەلێن ابو القاسم واتا بەشکار لەنێوان خەڵکان.

٢- **الطاهر :** کێشە هەیە لەسەر بوونی، بەلای هەندێکەوە دایکی (خەدیجە)یە لەشاری مەککە لەدایك بووەو مردووە، هەندێك دەڵێن الطاهر واتا عبدالله، جا ئەگەر وابێ دەبێت ئایا لەعائشە بێت، یا لەخدیجە هەندێکیش ئێژن الطاهر دەگەڵ المطهر جمکەنە.

٣- **ابراهیم:** دایکی ناوی ماریەی القبطی بوو، ماریە لەلایەن المقوقس خەڵاتی

پێغەمبەر (ﷺ) کرا، لەشاری مەدینەدا لەدایکی بووە، هەر لەئەوەیش مردووە .بەرواری لەدایك بوونی ساڵی هەشتی کۆچەری بوو، لەکاتی مەرگی ڕۆژ گیرا! خەڵك گوتیان: ئەمە لەبەر ابراهیمە ڕۆژ دەگیرێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەمە نیشانەی خودایە نەلەبەر مەرگی کەسێك ڕۆژ دەگیرێ، نەلەبەر بوونی، کاتێ مرد، پێغەمبەر (ﷺ) ئەشکی دەڕشت فەرمووی ئەی ابراهیم ئێمە بەداخی تۆوە خەمدارین.

٤- **الطيب** : زانایان کێشەیان هەیە، ئایا ئەمە لەسەردەمی نەفامی لەدایك بووە، یا لەسەردەمی پێغەمبەرایەتی، ئایا ناوی عبداللەیە، یان نا، هەروا لەخەدیجەیە، یاله عائشەیە، ئەگەر لەخەدیجە بێت، ئەوا لەمەککە لەدایك بووەو مردووە، ئەگەر لەعائشەش بێت ئەوا لەمەدینە بووەو مردووە. هەندێکش دەڵێن الطيب والطاهر هەریەکێکیان ناوی عبدالله یە ، هەندێکش ئێژن الطيب والمطيب دوو کوڕی جمکەن[٧٤].

## کچەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- **زینب**: یەکەمین منداڵی پێغەمبەرە (ﷺ)لەکچان، (ابوالعاص ابن ربيع) ئەم کچەیەی خواستووە، دایکی ناوی خدیجەبوو.

٢- **رقية**: دایکی ناوی خدیجەبوو، لەپێش پێغەمبەرایەتی شووی بە (عتبة أبو لهب) کرد، کاتێ سروش لەسەر محەمەد دابەزی أبو لهب بەعتبەی کوڕی گوت سەری تۆ لەمن ناڕەوایە، ئەگەر ئەم کچەیە بەرەڵانەکەیت، هێشتا نەچوو بووە لای، دەگەا خدیجەی دایکی موسلمان بوو، دواتر ئەم کچە شووی بەپێشەوا عثمان کردولەلای ئەو مرد.

٣- **ام کلثوم**: دایکی ناوی خدیجە بوو، لەپاش مەرگی رقية، ئەمەش شووی بەپێشەوا عثمان کرد، دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی مردنی أم کلثوم فەرمووی ئەی

عثمان! ئەگەر کچێکی دیم هەبووایە،یا دە کچم هەبووایە بە تەنها، بەتەنها هەر هەموویانم پێدەدایت!!!.

٤- **فاطمة:** دایکی ناوی خدیجة بوو، دوایین منداڵی پێغەمبەر بوو، کە لەپاش پێغەمبەر (ﷺ) مرد بێت، پێغەمبەر (ﷺ) تەمەنی ٤١ ساڵ بوو کە خودا ئەم کچەی پێدا هەندێك ئێژن پێنج ساڵ لەپێش پێغەمبەرایەتی لەدایکی بووە. ئەم کچە شەش مانگ لەپێش پێغەمبەر (ﷺ) ژیاوە،فاطمة شووی بە (علی) کردووە ئەم منداڵانەی هەبووە حسن–حسین–زینب–ام کلثوم–محسن، (کلثومی) کچی، شووی بەپێشەوا عمر کردووە پێغەمبەر (ﷺ)بارگەی بووکێنی بۆ کرد، پێستەوگۆزەو دەستاڕێك بوو[٧٥].

## وتار خوێندی پێغەمبەر (ﷺ):

١- ثابت ابن قیس ابن شماس

## بەر نوێژەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

١- ابوبکر الصدیق. ٢- عبدالرحمان بن عوف کێشە هەیە لەسەر بەر نوێژی کردنی[٧٦].

## شاعیرەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

١-کعب بن مالك . ٢-حسان بن ثابت بن المنذر بن عمروا بن حزام الأنصاری . پێغەمبەر (ﷺ) نزای بۆ کردو گوتی (اللهم ایده بروح القدس) واتا ئەی خودایە! جبریل ببێتە یارمەتی دەری! دەڵێن: لەپاش ئەم نزایە نەوەستا تا هەفتا بەیتە هۆنراوەی گوت.٣-عبدالله بن رواحة الخزرجي الأنصاری[٧٧].

## قازیەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

١- معاذبن جبل. ٢- ابو موسى الآشعرى. ٣- على ابى طالب. (بزانە هەرسێکیان لەولاتی یەمەن قازیەتیان کردووە).

## سەرکارەکانی پێغەمبەر(ﷺ):

١-على ابن ابى طالب. ٢-ابوعبيده. ٣-ابو هريرة. ٤- زياد ابن لبيد. ٥- العلاء ابن حضرمى. ٦- عدى بن حاتم. ٧- مالك بن نويره.

## وەزیرەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١-ابوبكر -٢-عمر -٣-جبريل -٤-ميكال

## پۆلیسەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١-على ابن ابى طالب ٢-زبير بن العوام المقداد. ٣-المغيرة ابن شعبة-٤-قيس بن سعد. -٥- عاسم بن ثابت.

## نهێنی دارەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١-انس بن مالك.٢- حذيفة بن اليمانى ٣- فاطمة

## ئەمیندارەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- ابوعبيده بن الجراح. ٢-معيقيب .

## گەنجینەدارەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١-بلال بن رباح پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: انفق بلالا

٢-علی بن ابی طالب پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ولاتخش من ذی العرش اقلالا.

## ئالا هەڵگرەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- جعفر ابن ابی طالب. ٢- سعدبن عبادة . ٣-خالد بن الولید. ٤-عبدالله بن رواحة. ٥-الزبیر بن العوام. ٦-علی بن ابی طالب.

## بەندەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١-فضالة. ٢-شقران. ٣-ابو رافع. ٤ - زید بن حارثة. ٥-مابوور. ٦-سلمان الفارسی ٧-بلال. ٨- سفینة ٩- ابو کبشة ١٠- سندر -١١-ساز -١٢-مهران-١٣-رویفع االمدعم(٧٨).

## کەنیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- ماریة القبطي. ٢- قنسر. ٣- سیرین. ٤- امیة. ٥- ام ایمن.

## فەرماندەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- بازان لەیەمەندا بوو، باوکی سامان بوو، لەنەوەی بەهرام، یەکەمین فەرماندەی ئیسلام بووە لەوڵاتی یەمەن، یەکەمین پادشای وڵاتی عەجەم بووە کەموسلمان بوو. ٢- خالد الولید لەالصنعاءبوو. ٣- زیدي لبید لە الحضرموت بوو، ئەمە هاوەڵێکی انصاری بوو.

٤- ابو سفیان لەالنجران بوو هەروا یزیدی کوڕی لەتیما بوو ٥-عتاب لەشاری مەککە بوو(٧٩).

## هەندێ لەئەوانەی قورئانیان دەرخكرد

١- ابو الدرداء . ٢- عثمان بن عفان. ٣- معاذ بن جبل. ٤- عباد الصامت. ٥- تميمى الدارى. ٦- زيد انصارى. ٧- زيد ثابت .

ئەمانە هەرهەموويان هاوەڵى پێغەمبەر (ﷺ) بوونە، الدميرى باسى ئەوانەى لەكتێبى حياة الحيوان كردووە.

## جێنشینەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

ابوبكر- عمر- عثمان-على-حسن

## هەندێك لەهاواڵە ئازاردراوەكان

١- ابوبكر. ٢- خباب ارث. ٣- ابو فهيكة. ٤- عمار.

## هەندێك لەدوژمنانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- عتبة. ٢- ابوجهل. ٣- ابولهب. ٤- وليد المغيرة. ٥-نضر حارث. ٦- ابو معيت..

## ئەوانەی ناونران بەمحمد بەنیازی پێغەمبەرایەتی:

١- محمدى خضاعي . ٢- محمد سفيان .٣- محمد جشعى ٤- محمد اسيد ٥- محمد قصيد

## ئەوانەی داوای پێغەمبەرایەتیان دەكرد:

١- عبهلة كعب. ٢- سجام مالك ٣-سلمة مالك.٤- لقيطى ازدى ٥- طلحة خويلد. ٦- مسيلمة كذاب

## نووسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) :

١- ابو بكر ٢- عمر ٣- عثمان ٤- علی ٥- عامر بن فهرة ٦-عبدالله بن الارقم . ٧- اُبي بن كعب، ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر (ﷺ) شارەزایەکی زۆری هەبووە لەسەر قورئانی پیرۆز، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لەهەموو هاوەڵانم شارەزاتر بەنامەی خودا (ابي بن كعب) ە ٨- ثابت بن قيس. ٩- خالد بن سعيج ١٠- أبي بن ابي سرح (٨٠)

## پاسەوانەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

١-سعد بن معاذ لەجەنگی بەدری مەزن. ٢- زبير بن عوام لەجەنگی خندق. ٣- مغيرة بن شعبة لەحديبيه ٤-محمدی مسلمة لەاحد

## بانگدەرەکانی شاری مەدینە:

١- سعد بن عائذ يان ابن عبد الرحمن کەناسراوە بە سعد القرظي لە قباء بانگی داوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) .

٢- ابو محذورة الجمحی المکی ، لەشاری مەککە بانگی داوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ، بزانە بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بەرنوێژی کردووە، بەڵام بانگی نەداوە، لەوەرامی ئەم پرسیارەدا النیسابوری فەرموویەتی: چونکە هەر کەسێك بەدوای بانگەکە نەهاتبوایە بەبێباوەڕ دادەنرا، شیخ عزالدین عبد السلام فەرموویەتی: ئەگەر بانگی بدابوایە، نابوایە وازی لێبهێنێ، هەروەك پێشەوا عمر گوتی ئەگەر لەبەر جێنیشنی نەبوایە دەبوومە بانگدەر.

## بانگدەرەکانی شاری مەککە:

١- بلال رباح حبشي، دایکی ناوی (حمامە) بوو، کەنیزەیەکی ابو بکری صدیق بوو، یەکەمین هاوەڵی بانگدەری پێغەمبەر (ﷺ) بوو، لەپاش پێغەمبەر (ﷺ) بانگی نەداوە، تەنها لەکاتی فەتحی شام لەسەردەمی پێشەوا عمر، کەداوایان لە بلال کرد بانگیان بۆ بدات، ئەویش قسەی نەشکاندن "ئەوانیش زۆر گریان دایگرتن، اسلمی بەندەی عمر گوتی: گریانی وەك ئەو ڕۆژەیان نەدیبوو، لەساڵی هەڤدەی کۆچەری یا ساڵی هەژدە مەرگی خودای بەجێهێناوە، لەتەمەنی سەدو هەندێك ساڵ هەندێك ئێژن گۆری لە حلب یا دیمەشقە.

٢- عبد الله ی مکتوم، ناوی عمر القرشی، هەندێك دەڵێن ناوی عبدالله یە، ام مکتوم داپیریەتی، ئەم هاوەڵە کۆچی کرد بۆ مەدینە لەپێش پێغەمبەر (ﷺ)، سورەتی (عبس) لەسەر ئەم پیاوە دابەزی، خودا بەپێغەمبەری گوت ئەم پیاوە کوێرە، پێت دەفەرمووی (علمني مما علمك الله) بۆچی رووتی لێوە دەگێری، ئەم دەوڵەمەندانەی قسەیان بۆ دەکەی، درۆ دەکەن بە گوێت ناکەن[81].

## ئەو پادشایانەی نامەی پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە کراوە

١- **پادشای یەمەن:** ڕاسپێری نامەکە (ابو موسای أشعری) بوو، هەروا (معاذي کوڕی جبلیشی) دەگەڵ دابوو، بەبێ شەڕ جەماوەرێکی زۆر موسلمان بوون.

٢- **پادشای بەحرەین:** ڕاسپێری نامەکە (علاء حضرومي) بوو، پادشا کە ناوی (المنذر بن ساوی) بوو، لەوەرامی نامەکەی پێغەمبەر (ﷺ)دا خودا دڵی نەرم کردو موسلمان بوو.

٣- **پادشای بلقاء:** ڕاسپێری نامەکە (شجاعی وهب) بوو ، پادشاکە ناوی (الحارث الغساني) بوو، نامەکەی پێغەمبەر (ﷺ)ی فڕەدا!

٤- **پادشای ڕۆم:** راسپێری نامەکە (دحية الكلبي) بوو، پادشاکە ناوی (هرقل) بوو نیازی هەبوو موسلمان بێت، بەڵام لەترسی نەتەوەکەیو لەدەست چوونی پادشایەتی نەوێرا ئەم نیازە بدرکێنێ.

٥- **پادشای فارس:** ڕاسپێری نامەکە (عبدالله حذيفة) بوو، نامەی پێغەمبەرمانی دڕاند، کاتێ ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشت پێغەمبەر (ﷺ) نزای لێکرد، ئەویش خێرو خۆشی لەخۆیەوە نەدی.

٦- **پادشای مصرو اسكندريه:** کەناوی (المقوقس) بوو، هەزار میسقال زێڕیان ڕەوانە کرد، دەگەڵ کەنیزەیەك کەناوی (ماریەی قبطی) بوو، ابراهیمی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) لەئەو ژنە بوو. هەروا خوشکێکیشی بەناوی شیرین، هەروا هێستری الدلدل – پۆشینە- هەنگوین دەگەڵ پزیشکێ، پێغەمبەر (ﷺ) تەنها پزیشکەکەی ڕەتکردەوە گوتی ئێمە گەلێکی کەم خۆرین، پێویستمان بە پزیشك نییە.

٧- **پادشای یمامە:** (سليط عمر) راسپێری نامەکە بوو، پادشا ناوی (هوذة) بوو، رێزی نامەی پێغەمبەر (ﷺ)ی گرت بەڵام موسلمان نەبوو.

٨- **پادشای عمان:** راسپێری نامە (عمرو بن العاص) بوو، پادشای عمان هەردووکیان موسلمان بوون.

٩- **پادشای یەمەن:** راسپێری نامە (مهاجير بن ابى امية) بوو، پادشا ناوی (الحارث الحميري) بوو.

١٠- **پادشای حبشە:** کەناوی (النجاشي) بوو، راسپێری نامە (عمرو بن امية) بوو، پادشا نامەی پێغەمبەر (ﷺ)ی لەسەر چاوانی داناو موسلمان بوو، لەکاتی کۆچ هاوەڵان خۆیاندا پەنای ئەو، لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) مرد لەساڵی ٩کۆچەری[٨٢] مرد.

## گەورێتی هەندێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ):

١- **ابوبكر**: پێغەمبەر(ﷺ)لەبارەیەوە فەرموویەتی: ان من امن الناس على في صحبته وماله ابوبكر، ولو كنت متخذا خليلا غير ربي لاتخذت ابابكر ولكن إخوة الاسلام ومودته لايبقين في المسجد باب إلا سد إلا باب ابیبكر.ب.م.ت. واتا: بەنازترین كەس لای من ابوبكرە، بەسامان و گیانەوە دەگەڵم بووە، ئەگەر خۆشەویستێكم بگرتبوایە جگە لەخودا ئەوا ابوبكر دەبوو ، چاكەی هەموو هاوەڵانم داوەتەوە جگە ئەو نەبێ.

٢- **عمر بن الخطاب**، پێغەمبەر (ﷺ)لەبارەی فەرموویەتی: لقد كان فيما قبلكم من الأمم محدثون، فإن يك في امتي احد فإنه عمر .ب.م.ت. واتا: لەپێش ئیسلامدا خودا پەرستی وا هەبووە، قسەیان زانیوە" ئەگەر كەسێك لەئومەتی من هەبێ شتی شاراوە بزانێ ئەوا عمرە.

٣- **عثمان بن عفان**. ان عثمان رجل ذو حياء م. واتا: بەڕاستی عثمان خاوەنی شەرموو ئابڕووە.

٤- **على بن ابي طالب**: انت منى بمنزلة هارون من موسى إلا انه لانبي بعدي.م.ت. واتا: ئەی عەلی تۆ بۆ من وەك هاروونی برای موسای" تەنها تۆ پێغەمبەر نیت.!

٥- **سعد بن الوقاص**: هذا خالي فليرني امرؤ خاله، واتا: ئەمە خاڵۆمە، دەبا خەڵكانیش خاڵۆیانم نیشان بدەن.

٦- **ابي بن كعب**: واقرؤهم لكتاب الله ابى بن كعب.ت. واتا: شارەزاترین كەس بەقورئان ابى كعبة.

٧- **معاذ بن جبل**: واعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل.ت. شارەزاترین كەس بەرەواو بەناڕەوا معاذە.

٨- **اسيد بن حضير**: نعم الرجل اسيد بن حضير.ت. واتا: اسيد باشترين پیاوە.

٩- **ثابت بن قيس**: نعم الرجل ثابت بن قيس شماس .ت. واتا: ثابت چاكترین پیاوە.

١٠- **طلحة بن عبيدالله**: من سره ان ينظر الى شهيد يمشي على وجه الارض، فلينظر

الى طلحة بن عبيدالله.ت. ابن ماجه. واتا: کەسێك پێی خۆشە سەیری شەهیدێکی سەر زەمین بکات، باسەیری ئەم پیاوە بکات.

١١- **الحسن بن علی:** ابني هذا سيد.ب.ت. واتا: ئەم ڕۆڵەی من گەورەیە.

١٢- **الحسين بن علی:** مني وانا من حسين احب الله من احب حسينا حسين سبط من الاسباط.ت. واتا: حسین لەمنە، من لەئەوم هەرکەسێك ئەوی خۆش بوێت، خودا خۆشی بوێت، حسین کچەزای منە.

١٣- **ابو عبيدة بن الجراح:** ان لكل امة امينا وان امين هذه الامة ابو عبيدة بن جراح.ب.م.ت. واتا: هەموو نەتەویەك ئەمیندارێکی هەیە، ابو عبیدە ئەمینداری منە.

١٤- **حذيفة بن اليمان:** ماحدثكم حذيفة فصدقوه.ت. واتا: حذیفة هەرقسەیەکی بۆ کردن، باوەڕی پێ بکەن.

١٥- **اسامة بن زيد:** وان هذا لمن احب الناس الى.ب.م. واتا: بەڕاستی خۆشەویسترین کەس لەلای من اسامەیە.

١٦- **عبدالله بن عمر:** ان عبدالله رجل صالح.ب.م. واتا: بەڕاستی عبدالله پیاوێکی چاکە.

١٧- **سعد بن معاذ:** اهتز عرش الرحمن، لموت سعد بن معاذ.ب.م.ت. واتا: تەختی خودا بەهۆی مەرگی سعدەوە لەرزی.

١٨- **ان عمرو بن العاص** من صالحي قريش.ت. واتا: عەمر لەپیاوە چاکەکانی قوڕەیشە.

١٩- **خالد بن الوليد** : نعم عبدالله خالد بن الوليد، سيف من سيوف الله.ت. واتا: باشترین بەندە خالدە، شمشێرێکە لەشمشێرەکانی خودا.

٢٠- **ابوهريرة:** اللهم حبب عبيدك وامه الى عبادك المؤمنين.م. واتا: ئەی خودایە ابوهریرەی بەندەت خۆشەویست بکە، دەگەڵ دایکی لەلای باوەڕداران.

٢١- **عبدالله بن قيس:** اللهم اغفر لعبد الله بن قيس ذنبه وادخله يوم القيامة مدخلا كريما.م. واتا: ئەی خودایە! لەعبدالله ی قیس خۆش بەو ببیە جێیەکی بەرێزەوە.

٢٢- **عبدالله بن سلام:** يموت عبدالله وهو آخذ بالعروة الوثقى، واتا: عبدالله کاتێ دەمرێ دەستی بەقوڵپی نەبڕاوەی باوەڕە.

٢٣- **انس بن مالك:** اللهم اكثر ماله وولده وبارك له فيما اعطيته.ت. واتا: ئەی خودایە سامان و منداڵی زۆر بکە، ئەوەی پێت داوە پیرۆزی بکەیت.

٢٤- **جليبيب:** هذا مني وانا منه، هذا مني وانا منه.م. واتا: دووجار فەرمووی من لەئەوم ، ئەو لەمنە.

٢٥- **معاوية بن ابي سفيان:** اللهم اجعله هاديا مهديا واهديه.ت. واتا: ئەی خودا! بیکە بەرێنوماکار هەم بۆ خودی خۆیو خەڵکان.

٢٦- **البراء بن مالك:** كم من اشعث اغبر، ذي طمرين لايؤبه لو اقسم على الله لابره منهم البراء بن مالك.ت. واتا: چەند پیاوێ هەژارو نەداری کەوتە بەردەرگان هەیە، ئەگەر سوێند بخوات بەخوداوە، خودا قسەی ڕەت ناکاتەوە، یەکێك لەئەمانە (البراء) ە .

٢٧- **عبدالله بن مسعود:** ولو كنت مؤمرا احد من غيره مشورة منهم لامرت عليهم ابن ام عبد.ت. واتا: ئەگەر کارێك بەبێ ڕاوێژی هاوەڵان ئەنجام بدەم، ئەوا ئەو کارە بە عبدالله ی مسعود ئەنجام دەدەم.

٢٨- **فاطمة بنت الرسول:** سيدة نساء اهل الجنة. واتا: فاطمە ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) گەورەی ژنانی بەهەشتە.

٢٩- **عائشة بنت ابى بكر:** فضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام.ب.م.ت. واتا: گەورێتی عائشە لەسەر ژنان، وەك گەورێتی مەرەگەو گۆشتە لەسەر خواردنان[٨٣].

## گەورێتی هەندێك وڵاتو نەتەوە

١- **الحجـــاز:** پێغەمبــەر (ﷺ) لەبارەیــەوە فەرموویــەتی: غلــظ القلــوب والجفــاء في المشرق والإیمـان في اهـل الحجـاز.م. واتـا: دڵ ڕەقیـو بێـوێڵی لـەنێو خـەڵكی ڕۆژ هەڵات باوە، باوەڕیش لەنێو حیجازدا باوە.

٢- **فارس:** لو كان الدین عند الثریّا لذهب بـه رجل من فارس او قال من اهل فارس حتی یتناوله.م. واتا: ئەگەر ئایین لەسەر ئەستێرەی (كۆبی) با، ڕۆڵەكانی فارس خۆیان دەگەیاندیّو دەیان قۆزتەوە.

٣-**شام:** إذا فسد اهل الشام فلا خیر لكم، لاتزال طائفة من امتي منـصورین لایـضرهم مـن خـذلهم حتـی تقـوم الـساعة. هـەركاتیّ خـەڵكی شـام گەنـدە بـوون، كـەلكتان نـامێنیّ، كۆمـەڵێك لەئومـەتی مـن هـەر سـەركەوتوو دەبـن، تـا ڕۆژی پەسـڵان هەڵدەستیّ، ئەوەی پاشقولیان لێدەدا زیانیان پیّ ناگەیەنن. ت.س.ص

٤- **یمن و عمـان:** ان لم نكـن مـن الأزد، فلـسنا من النـاس: ئەگـەر لەهۆزی ئەزد نـەبین ئەوا مرۆڤێكی بیّ تیرەو هۆزین.

٥- **العرب:** سام ابو العرب: سامی كوڕی نوح بابەگەورەی عەرەبە.

٦- **الروم:** ویافث من ابو الروم: یافث بابە گەورەی ڕۆمە.

٧- **وحام ابو الحبش:** حامی كوڕیشی بابە گەورەی حبشە، واتا ڕەش پیستەكان[٨٤].

## نەخشەی كۆچی پێغەمبەر(ﷺ):

پێغەمبـەر (ﷺ) پێوسـیتیەكانی ڕێگـەی كۆچـكردنی بـەڕادان دا، وەك دانـانی پێشەوا عەلی لەجێی خۆی، هـەروەها دوو كـەس بۆ دەلیلی ڕیّ ، كـڕینی دوو وشتر بەشـەش مـانگ لـەپێش كـۆچ، ئـەم وشـترانە تـا سـەردەمی ئەبوبـەكر مابوون، ئینجـا پشتی بەخودا بەست .

ئەگـەر بپرسـیتو بڵێیـت، باشـە پێغەمبـەر كـەدەیزانی سـەركەوتووەو متمانـەی

تەواوە، ئەم نەخشانەی پێغەمبەر سوودیان چی بوو،.

ئــەو خودایــەی کەپێغەمبــەری گەیانــدە (القــدس)، هەرئەوخودایــە بــوو کەپێغەمبەری گەیاندە (المدینة)، بەڵام گەشتی پێغەمبەر بۆ (القدس) گەشتێکی زێتر تایبەت بوو بەخودی پێغەمبەر ، بەڵام ئەم گەشتەیە ماڤ پێغەمبەرو هاوەڵانی تیادابوو ، جاپێغەمبەریش پێشەنگە بۆ ئێمەی موسلمانو هاوەڵانی(٨٥) .

## نەخشەی بێباوەڕان:

بێباوەڕان گرد بوونەوە لەشوێنێ پێیان دەگوت (دار الندوة) ئەم شوێنە یانەی (قصی حکیم) ی باوەگەورەی پێغەمبەر بوو، یانەی کۆبوونەوە بوو، کۆبوونەوەی بێباوەڕان لەئەم جارەدا کۆبوونەوەیەکی نهێنی بوو، دەرگایان پێوەدا بۆ ئەوەی کەس ئاگای لەنەخشەی شەیتانییان نەبێت، ژمارەی ئەوانەی لەم کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوون ١٥ کەس بوون بەقسەی (ابن درید) بەقسەی (دحیە)ش ١٠٠ پیاوبوون.

نەفامی بێباوەڕان گەیشە ئەو رادەیە کەوا لەهەموو لایەکەوە ئازاری پێغەمبەرو هاوەڵانیان دەدا، بۆیە پێغەمبەر ڕێگەیدا کەوا کۆچ بکەن بۆ (یثرب) واتا شاری مەدینە، چونکە ئەوکات مەدینە ناوی (یثرب) بوو، پلەی شاریەتی وەرنەگرتبوو، بۆ ئەم کۆچەش پێغەمبەر، تەنها ابوبەکری هێشتەوە دەگەڵ پێشەوا عەلی ئەمەش مەبەستی خۆی هەبوو ، دیارە ئەبوبەکری دەگەڵ خۆی کردە دۆست، بۆ کۆچ ڕەوی، بەئەم بۆنەیە یاران هەموویان کۆچیان کرد، جگە لەئەوانەی دیل بوون، ئەبوبەکریش زۆر داوای لەپێغەمبەر دەکرد، کەوا ئامادەیە بۆ کۆچ، بەڵام پێغەمبەر دەیفەرموو: (لاتعجل لعل الله یجعل لك صاحباً) واتا پەلە نەکەیت تاخودا دۆستێکت بۆ ڕێك دەخات، ئیدی بێباوەڕان کاتێ زانیان هاوەڵان لەگەرمەی کۆچ دانە، کۆبوونەوەیەکی نهێنیان بەست، گوتیان ئەگەر بێتو ئێمە محمد نەکوژین ئەم کارە لەسەرمان گرانتر

دەبێت، بۆیە یەکێ دەیگوت بەندی دەکەین تا دەمرێت ، یەکێ‌دەیگوت شوون بزری دەکەین ، ئەبوجەهل گوتی: نەخێر لەهەموو تیرەیەك گەنجێکی بەهێز ئامادەبێت‌و بەهەرهەموویان ئەم محمدە بکوژن، بۆ ئەوەی خوێنەکەی نەکەوێتە سەر هیچ لایەکمان .

جا(جبریل) هاتەلای پێغەمبەرو فەرمانی کۆچی بەپێغەمبەر ڕاگەیاند، پێغەمبەر چووە لای ئەبوبەکرو گوتی ئەمشەو دەبێت کۆچ بکەین، ئەگینا کار لەکار ترازایە ، ، بەنیازی قەردو سپاردەی خەڵکان پێشەوا عەلی لەجێی خۆی دانا ، ئێوارە هەرچوار دەوری ماڵی پێغەمبەر گیرا، کەچی پێغەمبەر بەناویاندا تێپەڕی‌و هیچ کەسێکیان پێغەمبەریان نەدیت، چونکە خودا ئەوانی خەواند، پێغەمبەریش عەباکەی خۆی دابەعەلی‌و دڵنیای کرد کەوانەترسی دەگەڵ ئەبوبەکر بەڕێکەوتن بۆ ئەشکەوتی (الثور)، ئەوکات تەمەنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ١٣ ساڵ بوو، هاوەڵان بەدزیەوە کۆچیان کرد، تەنها پێشەوا (عمر) نەبێت نرکەی دەهات، بەئاشکراوە دەڕۆیشت لەگەڵ زیدی برای، بەڵێ بێباوەڕان دەیانزانی کەوا پێغەمبەر ڕێگەکەی دروستە، بۆیە لەترسی نەمانی دەسەڵاتی پوچەڵیان، ئەم بەرنامە شەیتانیەیان داڕشت، نیازی ئەوەیان هەبوو کەوالەسەر نەمانن، ئیدی ابوجەهلی بەدکار گوتی: لەهەمووتیرەیەك گەنجێکی بەهێزووبازو ئامادە بێت بۆ ئەم کارە، مەبەستی ئەوەبوو کەوا خوێنی پێغەمبەر بەفیڕۆ بڕوات، بەڵام خودا پێغەمبەری خۆی ئاگادار کردەوە ئەوان خەریکی چین، دەیانەوێ چی بکەن لەخۆشەویستی خودا. ئیدی پێغەمبەرو ئەبوبەکر دوو وشتریان بەڕادان دا بۆ ئەم گەشتە، بەڵام بۆچی ئەوان پێغەمبەریان نەدی دەگەڵ ئەبوبەکر ؟ وەرام، چونکە پێغەمبەر سورەتی یس ی دەخوێند کاتێ بەناویاندا تێپەڕی لەئایەتی (فأغشيناهم فهم لايبصرون) بوو، خودای شکۆمەند خەواندنی.

هەرکەسێك لەئەو بێباوەڕانەی خۆڵی پێغەمبەری پێکەوت بەبێباوەڕی مردو

لەجەنگی البدر کوژرا، ئەمەش الحاکم بەدروستی گێڕاوەتیەوە ، بۆ بەیانی گەنجە بەکرێگیراوەکانی ئەبوجەهل، هەریەکە چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد محمد بدۆزنەوەو لەماڵ بێتەدەر، چونکە ئەوان نەیاندەزانی شەوی ڕابردوو لەپاسەوانی پێشەوا عەلی بووینەو پێغەمبەر بەناویاندا تێپەڕیوە، ڕق وقین دایگرتن و هەریەکەیان بەدوای دۆزینەوەی پێغەمبەرەوە دەگەڕان، هەتا کار گەیشتە ئەوڕادەیە هەرکەسێك ئەم (محمد)ە بدۆزێتەوە، سەدوشتر خەڵات دەکرێت، ئەم گەمژانە شوێنی پێی ئەبوبەکرو پێغەمبەریان دۆزیەوە، تا گەیشتنە ئەشکەوتی (الثور)، ئەبوبەکر لەپێش پێغەمبەرەوە چووە ناوئەشکەوتەکە، ئەمەش لەبەر پاراستنی پێغەمبەر بوو، ئەگەر تۆزێك سەریان بەرزبکردبوایە، ئەوا پێغەمبەرو ئەبوبەکریان دەدی، هەتا ئەبوبەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا حاڵمان شڕە پێغەمبەر گوتی (لاتحزن إن الله معنا) بەڵام ئەم پاشەکشەی ئەم بێباوەڕانە لەئەم ئەشکەوتە لەبەرئەو تەونۆکەی جالجالۆکەو هێلانە کۆترەکەبوو (أمیة بن خلف) گوتی: بابڕۆین ئەگەر ئەم ئەشکەوتە کەسێکی تیابێت، چۆن ئەم تەونەو هێلانەی لێیە، چۆن ئەم کۆترەی لێیە ؟ (سبحان الله) ابوبەکروپێغەمبەر قاچی بێباوەڕیان لێوەدیار بوو کەچی ئەوان چاویان کوێر بوو، نووسیاری (البردة) فەرموویەتی پێغەمبەر گوتی (اللهم اعم أبصارهم) واتا خودایە چاویان کوێر بکەی، جاپێغەمبەری سەروەرمان سێ شەو لەئەم ئەشکەوتە جێواربوو (عبدالله ی کوڕی ئەبوبەکر) لەشەواندا دەهاتە لایان، دەنگ وباسی ناوشاری مەککەی بۆ دەهێنان، هەروا هەرسێ شەو (أسماء)ی کچی ئەبوبەکر، خواردنی بۆیان دەهێنا عبدالله ی کوڕی ئەبوبەکریش شوانێکی هەبوو تێی گیاندبوو، أسماء لەپەنای مەڕەکانی ئەوەوە خواردن بۆ پێغەمبەرو باوکی ببات.

لەبەرەبەیانی شەوی سێیەمی ناو ئەشکەوت، کەدەکاتە ڕێکەوتی ڕۆژی دووشەممەی هەفت ڕۆژ لەمانگی ربیع الاول لەتەمەنی ٥٣ ساڵەی پێغەمبەردا،

کەمێژووی زێرینی پێغەمبەرایەتی ١٣ ساڵ بوو، دووڕێنیشاندەریان هەبوو (عامر فهیرة) کەبەندەی ابو بەکر بوو ، (عبدالله أريقط) بۆ ئەوەی ئەم دووپیاوە پێغەمبەرو ئەبوبەکر بگەیننە شاری مەدینە بەڕێگەیەکی ئاسایش، لەرێگەدا توشی (سراقة مالكي المدلجي) بوون سوراقە کەوتەدوویان و ولاخەکەی کەوتە سەر زەوی تاهاواری کردن و گوتی بەهانام وەرن ، چونکە تەپوتۆزو دووکەڵ لەژێر پێی ولاخەکەی دەردەچوو ترس دایگرت و گوتی: خۆم داوەتە دەستی ناسکی ئێوە، ئینجا پێغەمبەر وەستا، (سراقە) گوتی: چیتان دەوێت لەخۆراك من لامە هیچیان لێوەرنەگرت، تەنها گوتیان باسی ئێمە بشارەوەو لای کەس ئەم باسە مەدرکێنە، ئیدی سوراقە بەڕێی خۆیدا گەڕایەوە وەك ئەوەی کەوا هیچی نەدیبێت پێغەمبەرو ئەبوبەکریش دەگەڵ ڕۆیشتنیان بەردەوام بوون تاگەیشتنە (القباء) شوێنێکە لەنزیك مەدینەدا، پێغەمبەر لەلای هۆزی (عمرو بن عوف) دابەزی، ابوبەکریش چووە گەڕەکی السنح کەگەڕێك بوو لەمەدینەدا ئەوەندەی پێغەمبەر لە(قباء) مایەوە، مزگەوتێکی لێ دروست کرد، نوێژیشی تیاداکرد، دەگەڵ کۆچەرو یارمەتیدەران هەروا لە(قباء) پێشەوا عەلیش گەیشتە پێغەمبەر ، بەڵێ جەماوەری مەدینە هەموو ڕۆژێك تاکاتی گەرمای نیوەڕۆ چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەر بوون، هەتا ڕۆژێك گوێیان لێبوو یەکێك بەدەنگی بەرزەوە دەڵێت ئەی جەماوەری هاوەڵان ئەمەیە تانجی سەرتان، ئیدی یارمەتیدەران لەشادیانەی هاتنی پێغەمبەردا هەریەکەو بەسواری‌و پیادەوبەشمشێرەوە گەرمەی بەخێرهاتنیان بوو لەپێغەمبەر، هەریەکەیان خۆزگەی دەخوارد، کەوا پێغەمبەر ببێتە میوانی ئەو، ئەم سروودەیان دەگوتەوە.

*طلعَ البدرُ علينا — من ثنيات الوداع ،*

*وجبَ الشكرُ علينا — مادعا لله داع ،*

*أيها المبعوثُ فينا — جئتَ بالأمر مُطاع .*

*جئت شرفت المدينه — مرحبا ياخير داع*

ئەم هاتنەش لەڕۆژی هەینی بوو، پێغەمبەر نوێژەکەی لەماڵی (سالم ی عوف) کرد، لای ئەو بووبەمیوان، دواتر لەئەوێ ڕۆیشتو توشی هەرکەسێك دەبوو لەهەر کۆچەوکۆلانێك جلەوی ولاخەکەی پێغەمبەری دەگرتە دەستان و دەیویست پێغەمبەر ببێ بەمیوانی ئەو، بەلام پێغەمبەر دەیگوت: لەوشترەکە بگەڕێن، چونکە بەبێ فەرمانی خودا دانابەزێت، هەتا وشترەکە چووە ماڵی (أبو أيوب الانصاري) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئائەمە میوانخانەمە جا پێغەمبەر مانگێك لەئەوێ مایەوە مزگەوتی دروست کرد، هەروا دوو ژووری دروست کرد بۆ (عائشة) و (سودة)ی خێزانی .

ئەی موسلمانینە ! لەباسی کۆچی پێغەمبەرماندا هاوەلانی کۆچەرو یارمەتیدەرمان بەیەکەوە دەگەن دیارە کۆچەران دەچنە لای ئەوان ، ئەوانیش واتا یارمەتیدەران بەئەوپەڕی ڕێزیانەوە ڕێزیان لێدەنێن بەگیان - بەسامان - بەهەموو توانایەك ، خودا پاداشتی زۆرو زەبەنیان بداتەوە ئامین[٨٦] .

## کۆچەرو یارمەتیدەران لەقورئاندا

**خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی :**

(والسابقون الأولون من المهاجرين والأنصار والذين اتبعوهم بإحسان رضي الله عنهم ورضوا عنه وأعدَّ لهم جنات تجري تحتها الأنهار خالدين فيها أبدا ذلك الفوز العظيم)(التوبة/١٠٠) . واتا : پێشەنگانی یەکەمین لەکۆچەران و یارمەتیدەران و ئەوانەی کە بەچاکی پەیڕەویان لەئەوان کرد، خودای مەزن لێیان قایلەو ئەوانیش لەخودا قایلن، خودای مەزن لەبەهەشتدا باخگەلی بۆ ئامادە کردن، کەچۆمە ئاو بەژێر درختەکانیاندا دەڕوا، هەمیشە لەئەوێ دەمێننەوە، ئەمەش دەسکەوتێکی مەزنە) .

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خودای مەزن باسی گەورێتی هەردوو لای کردووە بەبێ جیاوازی، تەنها ئەوەندە نەبێت کەلەسەرەتادا ناوی کۆچەرانی هێناوە، بێگومان

گەورەیی ئەمانە لەسەدەها فەرموودەی پێغەمبەر (ص) دەکەوێتە بەرچاو بۆ نموونە کەسەیری کۆچەران دەکەین لەبەر خودا کۆچیان کرد، نەك وەك موسلمانانی ئیمڕۆ کەئەوسەرو ئەوسەری وڵاتانی بیانی بەسەر دەکەنەوە، کەچی حەجی ماڵی خودا لەتەمەندا جارێك پێویستە، ئەم حەج کردنەیان بەخەمو هەند دانەناوە، ئەمەش سەیرو سەمەرەی ئەوەیە کەوا چۆن شەرم ناکات، کەوا ئایەتی خودا دەخوێنێتەوە، ئایا ئەو شوێنەی کۆچی بۆ دەکات وڵاتی ئیسلامە ؟ ئەو لەبەر ئیسلام کۆچی کردووە ؟ ئایا ئیسلام ڕێ بەم کۆچەی داوە؟! ئەی پێغەمبەر نەیفەرمووە (من جامع المشركَ وسكن معه كان مثله.ا)(٨٧) واتا کەسێك دەگەڵ بێباوەڕان کۆبێتەوە ئەوا لەچەشنی ئەوانە ؟ خودا پەنامان بدات! باشەپێغەمبەر نەیفەرمووە (لاتسافر بالقرآن إلى أرض العدو)(٨٨).ب. واتا: قورئان نەبەنە ناوبێباوەڕان . خۆشەویستان هەقی ناهەقانە لەسەر ئەم قسانە بەرپەرچەمان بدەنەوە، چونکە ئیمڕۆ ڕۆژی چاولێکردنە، نەك ڕۆژی یاسای خودا، لەبەر ئەوەی وڵاتانی بیانی پرن لەشینە مەلاو شینە شێخو شینە پێشمەرگە، ئەگەر ڕوو لەمەلا دەکەیت وادەزانیٚ لەلای پێغەمبەری خوێندووە ! ئەگەر سەیری شێخ دەکەیت، ئەوا هەرنابێت زۆر لەئەحوالیشی بپرسی!، ئەگەر لەکاکی پێشمەرگە دەپرسیت وەرامی ئەو تەقەیە!. داخەکەی گرانم چۆن ئەم کوردستانەیان کردە کۆچستان، هەر ڕۆژەو سەدەها نەوە بار دەکەن بەناوی کۆچ، بە خودا سەیرە، باشە ئێوە نەتەوەی پێغەمبەر نین، چۆن بە هۆی پارە، قسەی ئەو پێغەمبەرە دەشکێنن!!!

داوای گشتیم لە سەرکردەکانە، کەوا لە خۆیانەوەڕا دەست بەنەهێشتنی ئەم سیمایە بەدە بکەن .

## هۆنراوەی کۆچ

کوردستانەکەم خاکی باوانم

من پێت قایلم سۆمای چاوانم

خۆش مەندم بە تۆ لە هەردوو ژیندا

کۆچت لێ دەکەن پیرو لاوانم

ئامێزی تۆیان لەبیر کردووە

کاتێ والات کرد لە هاوە لانم

لە هەموو ئاسیا تۆ یەکەم دەرچووی

بۆ وات لێدەکەن رووتو گاوانم

## دەوری هاوەڵان لەکۆچدا

یەکەمین کۆچکار (ابو سلمة) بوو ئەم هاوەڵە ژن و منداڵی جێهیشت لە پێناوی ئاڵای ئیسلام، واتە ئاینی پیرۆزی ئیسلامی خستە پێش ژن و منداڵ و سامانی.

هەروا (صهیب) هاوەڵی پێغەمبەر بوو، هەموو سەروەتوو سامان و منداڵی جێهێشت قورەیشیەکان گوتیان ئەی (صهیب) تۆ لەنێو ئەم شارەدا دەوڵەمەند بویت، کەواتە ئێمە رێت پێ نادەین سامانتەوە کۆچ بکەیت بە (صهیب) گوتی: باشە ئەگەر هەموو سامەنەکەتان پێبدەم لێم دەگەرێن؟ گوتیان بەڵێ، گوتی: ئەوا هەموو سامانەکەم بە ئێوە دا، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی (صهیب)ی پێ گەیشت فەرمووی: (ربح صهیب)، واتە: قازانجی کرد.

دەگێرنەوە لە (أنس) گوتی: پیرە ژنێکی کوێر کورێکی دەگەڵدا بوو، ئێمەش دەگەڵ پێغەمبەر لە الصفة دانیشتبووین، لەپاش چەند رۆژێك کوری پیرەژن تووشی تاعون بوو بە خودا سپارد، ئێمەش کورەمان داپۆشی و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

بڕۆن بانگی دایکە کوێرەکەی بکەن، کاتێك دایکی هات گوتی: ئەوا جگەر گۆشەی من مرد گوتمان: بەڵێ گوتی ئەی خودایە! من بەئارەزووی خۆم هاتمە نێو ئەم ئایینە ، بێباوەڕیم فڕدا ، بێباوەڕانم پێ خۆش نەکەی ، توانای جەرگ سووتانم نیە! انس گوتی: پێی بزواندو زیندوو بوویەوە، لە پاش پێغەمبەریش ئەم کوڕە هەر مابوو[89]!

## ڕوو داوەکانی ساڵانی کۆچەری‌و بەرهەمی ساڵەکان

ساڵی یەکەم:چوونە مدینە- گەڕانەوەی کۆچەرانی حبشە بۆمدینە- جەنگی ابواء بانگی نوێژ درا – مارە کردنی عائیشە . دروستکردنی دوو مزگەوت- مزگەوتی قباء- مزگەوتی پێغەمبەر، سودەی خێزانی پێغەمبەر گەیشتە مدینە – عبداللە ی زبیر لە دایکی بوو-موسلمانبوونی عبدالله کوری سلام و سلمانی فارسی-برایەتی نێوان یارمەتی‌دەروکۆچەران .بەستانی لەشکری‌حمزەو- أبوعبیدەو-لەشکری سعدی وقاص.مەرگی کلثومی‌ابن هدم و-ابی‌أمامة.

ساڵی‌دووهەم: جەنگی البوات-جەنگی العشیرة-جەنگی بەدەر -جەنگی السویق-فەرزبوونی ڕۆژووزەکات‌وسەر فترە-مەرگی رقیة کچی پێغەمبەر- بەشوودانی فاطمة ی کچی‌پێغەمبەر -گۆڕانی رووگە-نوێژی جەژن-غەزای القینقاع ونجران- ڕەوانکردنی سریەی سعدی وقاص‌و-عبدالله ی‌جحش.

ساڵی سێهەم: جەنگی غطفان وبنی‌سلیم وأحدو-حمراء-مارەکردنی حفصة- بەشوودانی کلثوم – شەهیدبوونی حمزة وعمروالجموع وأنسی الفضل سعدی الربیع. کوشتنی کعب ی أشرف و أبی‌رافع.

ساڵی چوارهەم: جەنگی الیهود-البدر کۆتایی – ذات الرقاع- ناڕاوابوونی ئارەق‌وقومار-مارەکردنی زینب-مارەکردنی سلمة.لەدایکبوونی حسین ی‌کوڕی-

شەهیدبوونی عاصم ی ثلبت وعمری ثابت وعمری فهیرة–دەرچوونی أبوسفیان.

ساڵی پێنجەم: گواستنەوەی زینب ی جحش– جەنگی الخندق البنی قریظة– مردنی سعدی معاذ – شەهیدبوونی خلاد بن سوید – لە نێوچونی امیة بن الصلت میوانداری جابر لە الخندق – حوکمی سعد لە البنی قریظة مەرگی دایکی سعدی عبادة .

ساڵی شەشەم: هەلبەستانی افك – نوێژە بارانەی پێغەمبەر – سریەی محمدی بن مسلمە بۆ القرظا – سریەی زیدی بن الحارثة بۆ البنی سلیم و العیض و البنی ثعلبة و حسمی – سریەی عبد الرحمان بن عوف بۆ دومة الجندل – سریەی کرز بن جابر بۆ لای العرنیین .

ساڵی هەفتهەم: ڕەوانە کردنی نامە بۆ پادشایان – سریەی عمربن الخطاب بۆ نزبة – گەیشتنی دیاریەکانی پادشا المقوقس بۆ پێغەمبەر، کوشتنی شێرەوی کیسرا – گواستنەوەی میمونەی خێزانی پێغەمبەر – سریەی ابن ابی العوجاء بۆ بنی سلیم .

ساڵی هەشت هەم: موسوڵمان بوونی خالید بن الولیدو عمروبن العاص و عثمان بن الحجبی سریەی بشر بن سعد بۆ الیمن – سریەی غالب بن عبدالله – دروستکردنی المنبر – سریەی عمروبن العاص بۆ ذات السلاسل – سریەی أبوعبیدة بۆ سیف البحر – غەزاوفەتحی مکە – موسمانبوونی أبوسفیان الحرب –سریەی خالدبن الولید لەپاش فەتحی مکە بۆ العزی–سریەی عمروبن العاص بۆ سوراع کە بنی هذیل بوو– سریە خالد بن الولید بۆ بنی الجذیمة – غزای حنین والطائف – موسلمانبوونی عروة بن المسعود الثقفی .

ساڵی نۆهەم: ڕەوانەکردنی عیینة بن حص بۆ بەنی تمیم – ڕەوانە کردنی الولید بن عقبە بۆ بنی المصطلق – موسلمانبوونی ثقیف – موسلمانبوونی کعب ی زهیر– نامەی پادشایانی حمیر – بەردەبارانی الغامدیة – مەرگی أم کلثوم – حەجی

ابوبكر – مردنی عبدالله یذی البجادی.

سـاڵی دەهـەم: ڕەوانـەکردنی معـاذ جبـل وأبوموسـی الاشـعری بـۆ یمـن، ڕەوانەکردنی خالید بن الولید بۆ بنی الحرث له نجران– ڕەوانەکردنی علی أبوطالب بۆ یمن – ڕەوانەکردنی جریر عبدالله البجلی بۆ ذی الکلاب – ڕەوانەکردنی أبو عبیده بۆ نجران – مردنی ابراهیمی پێغەمبەر، دەرکەوتنی جبرایل بۆ دانیشگای پێغەمبەر – مەرگی بازانی سامانی فەرمانڕەوای یمن – هاتنی فیروز الدیلمی بۆ مدینە .

سـاڵی یانزەهـەم: هـاتنی پـەیامنێری النخـع – سـریەی أسـامة بـۆ أبنـی – وەلاکەوتنی أسوودی العنسی – چیرۆکی مسیلمة الکذاب – کوشتنی اسود العنسی – چیرۆکی سجاح [٩٠].

## ڕۆژمێری عەرەبیو هیجریو
## پێش ئیسلام

عـەرەب پـێش ئیـسلام رۆژ ژمێرێکـی نـەبوو، بـۆ دیـاری کردنـی مێـژوو و جێگیرکردنـی کارەسـاتو ڕووداوەکانیـان ، بـەڵکو زۆر ڕۆژمێریـان بـەکاردەهێناوە چـونکە هەرخێڵـەو ڕۆژمێرێکـی تایبـەت بـەخۆی بـەکاردەهێنا، یـان هـی یـەکتریان بەکاردەهێنا . هەریەکە لە ئەو خێڵانە بەگوێرەی هەر ڕووداوێکی گرنگ لەژیانیان مێژوویان دادەنا، وەك دروست کردنی کەعبە لەلایەن ئیبراهیم وئیسماعیل (سلاوی خوایان لێبێ)، هەندێکی تر بەسەرۆکایەتی نوێی سەرۆك خێڵ مێژوویان دادەنا یاخود بەمردنی ...هتد...

یەك لە ڕۆژمێرەکانی کەزۆر بەسوودو گرنگ بوو زۆر ئیشی پێدەکرا ڕۆژمێری ساڵی (فیل) بوو لەوڕۆژەش دانراکە پادشای حەبەشە (أبرهه) هێرشی بەفیل کردە سەر کەعبەو ویستی بیڕوخێنێ.. هەر لەوساڵیش پێغەمبەر (محمدی کوڕی عبدالله)

(ﷺ) لەدایك بوو لەساڵی (٥٣) پێش کۆچی و (٥٧١)ی زایینی ئەو ڕۆژمێرە پێش ئیسلام و دوای ئیسلامیش هەرکاری پێدەکرا تا ڕۆژمێری (کۆچی) هاتەکایەوە.

## داهاتنی رۆژمێری کۆچی..

پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەساڵی (١١)ی کۆچی وەرگرتنی بەڕێوەبردنی موسلمانان لەلایەن (خەلیفە ڕاشیدیەکان) دەست کرابە ڕزگار کردنی ئیسلامی (الفتوحات الأسلامیة) بۆ فرەوانکردنی گۆڕەپانی ئیسلامی.. دەبوا موسلمانان ئاوڕێك لەمێژوو بدەنەوە بۆ دەست نیشانکردنی ساڵ و مێژوو بۆگرنگی ئەو ڕووداوانەی کەئەوسا رووی ئەداو جگە لەوپارەو باج و زەکاتەی وەرئەگیرا.. هەندێ مێژوونووس کرانەوەی ئیسلامی زۆر مێژوو و ڕووداویان بەرۆژ ژمێری زایینی تۆمار دەکرد ، ئینجا بیریان کردەوە بۆ چارەیەك لەساڵی (١٧)ی کۆچی ، خەلیفە (عمری کوڕی خەتاب) (خوا لێی ڕازی بێ) هەموو ڕووە ئیسلامیە گرنگەکانی کۆکردەوەو باسی دانانی ڕۆژ ژمێری ئیسلامی .

سەرەتاکەی گرنگترین رووداوی ئیسلامی بێت .. هەندێکیان بۆ چوونیان وابوو، رۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) ، هەندێکی تر رایان وابوو کە رۆژی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بێت، بەڵام ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی ڕازی بێ) وای پێ جوان بوو سەرەتای رۆژمێری رۆژی کۆچ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) لە(مەککە) بۆ (مەدینە)، ئینجا هەموو لایەك پێشنیارەکەیان پێ ڕاست و جوان بوو، گرینگترین و سەرکەوتوترین رووداو بوو بۆ ئیسلام ، هەربۆیەش ناوی نرا رۆژمێری (کۆچی) یا(هیجری)..

# پشت بەستی ڕۆژمێری ئیسلامی

لەدانانی ڕۆژمێری ئیسلامی یاخود (هیجری) پشتیان بەست بەڕۆژمێری (ساڵی فیل)، پاش دەستکاریەکی زۆر کە دین چەسپاندی بۆ دانانی ڕۆژمێرێکی ئیسلامی.

پاش دەستکاریو گۆڕانکاریەکی زۆر ئەو ڕۆژمێرە ئیسلامیەی لێدروست بوو ئێستا هەموو موسلمانانی جیهان لەڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوا کاری پێدەکات. دەست کاری‌یەکان لەم جۆرە بوون .

# ڕۆژەکانی حەفتە ..

ناوی ڕۆژەکان بەم ناوانەی ئێستایە. ڕۆژی هەینی دانرا بە جەژنی حەفتانەی ئیسلامی بۆ پەرستنو پشوودانو کۆبوونەوەو هاتووچۆی یەکتری، وەك لەقورئانی پیرۆز خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ . ڕۆژەکانی حەفتە ، حەفت ڕۆژە هەمووشیان هەر پیرۆزن هەر ڕۆژێکیان میللەتێك یان دیانەتێك کردوویەتی بەڕۆژی خۆی، وەك : ڕۆژی شەممە بۆ جوو.. ڕۆژی یەکشەممە بۆ مەسیحی.. ڕۆژی دووشەممە یۆنانیە کۆنەکان ڕێزیان لێدەنا.. ڕۆژی سێشەممە فورس بەڕۆژی خۆیان دەزانی.. ڕۆژی چوارشەممە ئاشوریەکان.. ڕۆژی پێنج شەممە میسریە کۆنەکانو هیندەکان.

# ناوی مانگەکان

زۆر ناو هەبوو بۆ مانگەکانی عەرەبی یان مانگی (قمری).. بەلام پاش پشت بەستن بە ڕۆژ ژمێری هیجری ناویان بەم جۆرە نرا، وەك ئێستا ناوی نراوە.. (موحەڕەم).. یەکێکە لەمانگەکانی، بێ گوناح.. بێ شەڕ. (ڕەبیعەکان).. (یەکەمودووەم) کەوتۆنەتە وەرزی پایز کە ئەو کاتەی عەرەب بەپایزی دەگوت

(ربیع) یاخود (بەهار).. (جەمادەکان) (یەکەوکۆتایی) ئەمانیش دەکەونە کاتی بەستنی ئاو لەزستان، لەوکاتەی ناونراون واتە (بەستن).. (ڕەجەب) واتە گەورەکردن، ئەمیش زیاتر بۆ وازهێنان لەشەڕ لەومانگە.. (شەعبان) ئەمیش بەمانای ئەوەی هۆزەکان کۆدەبوونەوە بۆ مشتوومڕکردن لەم مانگە.. (ڕەمەزان) ئەم ناوەش مانای لەوشەی (الرمضاء) هاتووە، بەمانای بەردی گەرم لەوکاتەی گەرما پەرەدەستێنێ.. (شوال) کاتی پەڕینی (وشتر)ە.. (ذوالقعدة) بەمانای دانیشتن لەشەڕ، واتە وازهێنان لەشەڕکردن لەومانگە.. (ذوالحجة) بۆ ئەنجامدانی فەریزەی (حەج) کردن..

جێگیرکرنی رۆژی دەست پێکردنی سەری مانگ (قەمەری)، جێگیرکردنی سەری مانگ، یاخود دەست نیشان کردنی، دانراوە بەدیتنی مانگ یاخود (هیلال) دوای ٣٠ ڕۆژی مانگی ڕابردوو .

زیاتریش بۆ دەست نیشان کردنی، سەری مانگی (ڕەمەزان)و مانگی (حەج) کردن لەلای موسلمانان .. وەك کەلە قورئانی پیرۆز هاتووە، لەسوڕەتی البقرة ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ﴾ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) (صوموا لرؤيته وافطرو لرؤيته وان غم عليكم فأكملوا عدة شعبان ثلاثين ثم صوموا).

هەروەك ڕۆژووگرتنو حەج کردن فەرزە لەسەر موسلمانان لەمانگی (قەمەری)، وەك خوای گەورە دەفەرموێ لەسورەتی البقرة ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ لەسورەتی (ال عمران) دەربارەی حەج دەفەرموێ ﴿وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾.

# ژمارەی مانگەکانو مانگە حەرامەکان
# أشهر الحرم و مانگی قەمەری

دوازدە مانگە.. تیایدا چوارمانگ مانگی (حەڕامن) سێ مانگ لەدوای یەك (ذو القعدة، ذوالحجة، محرم) مانگی چوارەمیش مانگی (رجب) شەڕکردن تیایدا حەڕامەو کوفرە. وەك لەسورەتی التوبة خوای گەورە دەفەرموێ ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلاَ تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ * إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُ عَامًا لِّيُوَاطِؤُواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ اللّهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُوءُ أَعْمَالِهِمْ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ .

بەڵام مۆڵەتی شەڕکردی داوە لەم مانگانە کاتی پێویست بۆ شەڕ لەپێناوی خوداو ڕێبازی ئیسلام، وەك دەفەرموێ لەسورەتی البقرة ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ﴾ .

## لەوتاری پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ڕۆژ ژمێر..

پێغەمبەر محمد(ﷺ) لەیەکێك لەخوتبەکانی لەساڵی (١٠)ی کۆچی دەربارەی ڕۆژ ژمێر دەفەرمووێ :

(ايها الناس انما النسيء زيادة في الكفر، يضل به عاما ليواطئوا عدة ماحرم الله فيحلوا ماحرم الله ويحرموا ماحل الله وان الزمان قد إستدار كهيئة يوم خلق الله السموات والارض، وإن عدة الشهور عند الله إثنا عشر شهرا منها اربعة حرم ثلاثة متوالية ذو العقدة وذوالحجة والمحرم ، والرابع هو رجب مضر الذي بين جمادى وشعبان) .

# دەستنیشان کردنی ساڵی کۆچی (هیجري).

موسلمانەکان پێش گوێڕایەڵی ڕۆژژمێری (کۆچی) ساڵەکانیان دوای هیجرەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەگوێرەی ڕووداوی ساڵە کەدەست نیشان دەکرد وەك:

| ساڵ | ناوی ساڵ | ڕووداوی ئیسلامی (کەئەو ساڵە ڕووی داوە). |
|---|---|---|
| یەکەم | ساڵی (الآذان)/ڕێدان | واتا پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ڕێی دان کەکۆچ بکەن لەمەککە بۆ مەدینە . |
| دووەم | ساڵی (الامر) فەرمان | فەرماندان بەموسلمانان شەڕ لەگەڵ ئەوکەسانە بکەن، شەڕیان لەگەڵ دەکەن. |
| سێیەم | ساڵی (التمحیص) بەخۆداچونەوە | لەم ساڵە (غزوة احد) ڕووی داو لەم غەزوە بەخۆیان داچوونەوەو لەکاروباری خۆیان گەیشتن لەم شەڕەدا بەسەریان هات . |
| چوارەم | ساڵی (الترفئة) | لەم ساڵەدا دەرچوونی (ئیجلائی) یەهود بوو لەمەدینە.. |
| پێنجەم | ساڵی (الزلزال) | لەم ساڵە (غەزوەی ئەحزاب) ڕووی دا . |
| شەشەم | ساڵی (الاستئناف) | لەم ساڵ بیعەی (الرضوان) ڕوویدا پاش ڕێپێنەدانی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم الله) بۆ مەککە .. |
| حەوتەم | ساڵی (الاستغلاب) | لەم ساڵە غەزوەی (خەیبەر) ڕوویداو تیایدا موسلمانان سەرکەوتن بەسەر یەهودیەکان . |
| هەشتەم | ساڵی (الاستواء) | چوونە بۆ ناو مەککە (فتح مکه). |
| نۆهەم | ساڵی (البراءة) | تیایدا سورەتی (البراءة) دابەزی. |
| دەهەم | ساڵی (الوداع) | تیایدا پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لەحەجەکەی ماڵئاوایی لەیاوەرەکانی کرد . |

پاش پشت بەستن بەڕۆژژمێری کۆچی ئینجا ساڵەکان دەستنیشان دەکران بەژمارە، یان دوای کۆچ کردنی پێغەمبەر(ﷺ).

## (حیسابی مانگی) .. مانگی هیجری

ڕۆژژمێری هیجری (مانگی) یاخود (القمري) پشت بەسوڕانەوەی مانگ لەدرەی زەمین دەبەستێ ، واتە دیارکەوتنی مانگ پاش ئاوابوونی ڕۆژ یەکسەر یان پاش لەدایك بوونی یان بەدیارکەوتنی بەچەند دەقیقەیەك.. وەدیارکەوتنی مانگ دوا دەکەوێت بەگوێرەی شوێن . شارێك بۆ شارێك، یان وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر جیاوازی هەیە کاتی دەرکەوتنی مانگ. چونکە وڵاتە ئیسلامیەکان گشتیان لەتەك یەکتری نین و جیاوازی جوغرافی ئەم جیاوازیەی دروست کردوە. بەڵام ئەم دواکەوتنە لەدەرکەوتنی مانگی لەڕۆژێك زیاترناخەیەنێت. بەڵام زۆر کەم ڕوودەدات کە دوو ڕۆژ بێت، هەربۆیەش ژمارەی ڕۆژەکانی مانگ بەگوێرەی بۆچوون هەر (٣٠) ڕۆژە (مانگی قەمەری)، لەشوێنێکی تر (٢٩) ڕۆژە.. بەڵام جێی پێزانینە کە لەڕۆژمێری دەست پێدەکات پاش ئاوابوونی ڕۆژەوە کۆتایی دێت ، لەئاوابوونی ڕۆژی دووەم..شایەنی باسە.. مانگ بەدەوری زەمین دا دەسوڕێتەوە ، زەمین بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوەو بەدەوری ڕۆژیشدا دەسوڕێتەوە.. سوڕانەوەی مانگ بەدەوری زەمین بۆ ماوەی ساڵێك ، جێگیر نیيە.. بەنزیکی بۆ ماوەی مانگێك (٢٩) ڕۆژو (٦) کاتژمێرو (٤٥) دەقیقە . (ئەمە بەلایەنی کەمیەکە).(٢٩) ڕۆژو (١٩) کاتژمێرو (٥٥) دەقیقە (ئەمە بەلایەنی زۆریەکەی)، ئەو دوو ماوەیە لەسەرتاپای ساڵ یەکسان نین..بەڵام مانگی (قەمەری) تەواو سروشتی لەئاوابوونی ڕۆژ مانگ بەدیاردەکەوێت، کەیەکەم ڕۆژە پێی دەڵێن (هیلال) ئەمە کۆتایی مانگ ڕابردووەو سەرەتای مانگی داهاتووە، بەڵام ئەگەر پاش ئاوابوونی ڕۆژی (٢٩)هەمین ڕۆژ، مانگ نەبینرا، ئەوا دیاری دەکرێت مانگەکە (٣٠) ڕۆژ بووەو بۆ بەیانی بەدیار دەکەوێ.. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەش ، یاخود کێشەی ئەوەی ئاسمان باران و هەورو تەم و هەموو بارە سروشتیەکان نالەبارەکانی ئاسمان کەتیایدا ناتوانی مانگ ببینی،

(بنکەی حیسابی فەلەکی)، هەموو ڕۆژ ژمێرە هیجریەکانی جیهانی موسڵمانان چاك کردوو یەکیخست. زۆربەی دەوڵەتە ئیسلامیەکان کاری پێدەکەن زیاتر لە (١٠٠) ساڵ بەرلەئێستاو تاکو ئێستاش ، زۆربەی هەرەزۆری کاتیش ئەم ڕۆژژمێرە یەکسانە لەگەڵ سروشت، تەنها هەندێ کات نەبێ کەزۆر کەم ڕوودەدات ڕۆژێك جیاوازیان بێت.. دەرئەنجامی سوڕانەوەی مانگ بەدەوری زەوی نزیکەی (٢٩) ڕۆژو (١٢) کاتژمێرو (٤٤) دەقیقەو (٨ر٢) چرکە .. کەساڵانە (٣٥٤ر٣٦٦٦٦) ڕۆژە ..

وادانراوە کەمانگە تاکەکانی هیجری (مانگی یەکەم ، سێیەم ، پێنجەم...هتد) کەبە(٣٠) ڕۆژ دانراوە . مانگە جووتەکانیش (دووەم ، چوارەم ، شەشەم...هتد) بە (٢٩) ڕۆژ دانراون.. بەڵام نزیکەی (٤٤) دەقیقەو (٨ر٢) چرکە دەمێنێتەوە لەهەر مانگەی کەواتە لەهەر ساڵەی (٨) کاتژمێرو (٤٨) دەقیقە دەمێنێتەوەو نزیکەی(٦ر٣٣) چرکەش لەساڵی هیجری دەمێنێتەوە.. کەواتە (٣٠) ساڵ (١١) ڕۆژ زیاد دەبێت، هەر بۆیەش لەهەر یازدە (١١) ساڵ ڕۆژێك زیاد دەکرێت لە(٣٠ساڵ )کە پێی دەڵێن ساڵی(کەبیسە) و ١٩ ساڵەکەی تریش (لە٣٠ساڵەکە) پێی دەڵێن ساڵی ئاسایی. ڕۆژە زیادەکەی زیاد دەکرێت لە ساڵی کەبیسە دەکەوێتە سەر مانگی (ذو الحجة) کە ڕۆژەکانی دەبن بە (٣٠) ڕۆژ، کەواتە ساڵی سروشتی(هیجری (٣٥٤) ڕۆژە کە دەکاتە ٥٠ هەفتەو ٤ ڕۆژ ، بەڵام ساڵی (کەبیسە)، (هیجری)(٣٥٥) ڕۆژە، کە دەکاتە (٥٠) هەفتەو (٥) ڕۆژ، کەواتە لە هەر ٣٠ ساڵی هیجری ١١ ساڵ کەبیسەیەو ١٩ ساڵ سروشتیە..

# مێژووی وەرزو جەژنو پشووەکانی ئیسلامی

لەم خشتەیەدا هەموو جەژنو بۆنە ئیسلامییەکان ڕوون دەبنەوە..

| ڕۆژ | مانگ | بۆنە جەژنە ئیسلامیەکان | پشووە یان نا |
|---|---|---|---|
| ١ | محرم | سەری ساڵی هیجری | پشووە |
| ١٠ | محرم | یادی (عاشوراء) یادی شەهید کردنی ئیمام (حسین) (خوا لێی خۆش بێ) ساڵی (٦١) هیجری | پشووە |
| ١٢ | ربیع الأول | ڕۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەرمان محمد کوڕی عبدالله (صلى الله علیه وسلم) | پشووە |
| ٢٧ | رجب | یادی (الاسراء والمعراج) | پشوو نیە |
| ١٥ | شعبان | یادی گۆڕانی قیبلەی پیرۆز لە(بیت المقدس) بۆ (کعبەی پیرۆز) ساڵی (٢)ھ | پشوو نیە |
| هەموو ڕۆژەکان | رمضان | بەڕۆژوو بوون بەهۆی فەرزی خودای گەورەو میهرەبان | پشوو نیە |
| ١٧ | رمضان | یادی غەزای بدر (ساڵی)(٣)ھ | پشوو نیە |
| ٢٧ | رمضان | (لیلة القدر) یادی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەر محمد (ﷺ) | پشوو نیە |
| ١-٣ | شوال | جەژنی ڕەمەزانی پیرۆز | پشووە |
| ٩ | ذو الحجة | ڕاوەستان لەسەر چیای عەرەفات لەوەرزی حەج کردن | پشوو نیە |
| ١٠-١٣ | ذو الحجة | جەژنی قوربانی پیرۆز | پشووە[٩١] |

# مەرگی پێغەمبەر (ﷺ)

برایانی باوەڕ دار! ئەم باسە باسی سەرگوزشتەی مەرگی پێغەمبەر(ﷺ). ئەگەر بهاتبوایە جگە لەخودا کەسێك لەژیندا مابوایە، ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) دەبوو، بەڵام پێغەمبەریش وەك هەموو دروستکراوانی خودا ماڵئاوایی لەسەرجەم هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئۆمەتەکەی کرد. من سەرەتای ئەم باسەت بۆ دەڕازێنمەوە بەفەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ)دواتر کورتەی سەر گوزشتەی مەرگی پێغەمبەر(ﷺ) دەخەمە بەر دەستت، ئەویش بێئەوەی کەوا کەم و زێدەییم لێی ئەنجامدا بێت، هەر ئەوەندە، عەرەبییەکەم کردۆتە کوردی.

بەندەی پێغەمبەر ابو مویهبە گوتی: لەناوەڕاستی شەودا پێغەمبەر بەدواییدا ناردم ، کاتێك چووینە سەر گۆڕستان، پێغەمبەر سڵاوی لێکردن و فەرمووی خودا، دەستتان لەئاسانی بگرێت، کە خەڵکان لەمەولا بەدواتانەوە دێت، هەروەها فەرمووی فرتێنەی زۆرو زەبەنگ، وەك شەوە زەنگ بەدواتانەوە دێت، بەڵام ئەوانەی لەدواییندا گیرۆدەی ئەم فرتێنەیە دەبن حاڵی ئەوان خراپە!

دەگێڕنەوە لەعائشە گوتی بیستوومە پێغەمبەران نامرن، تا سەر پشکدەکرێن لەسەرە مەرگی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا﴾زانیم مەرگی هەڵبژاردووە.

وعن علي انه قال أوصاني رسول الله ان لايغسله غيري، فإنه لايرى احد عورته الا طمست عيناه. واتا پێشەوا علی گوتی: پێغەمبەر(ﷺ) منی راسپاردووە، جگە لەخۆم کەسی دی نەیشوات، چونکە جگە لەمن هەرکەسێك تەرمی پێغەمبەر بشوات کوێر دەبێت.

عن عبدالله مسعود دخلت على رسول الله وهو يوعك فقلت يارسول الله انك لتوعك وعكا شديدا؟ قال أجل اني اوعك ذلك، كذلك مامن مسلم يصيبه اذى حتى الشوكة فما فوقها الا كفر الله بها سيئاته كما تحط الشجرة ورقها. دەگێڕنەوە لەعبداللەی مسعود گوتی چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) ژانە سەری دەبێت گوتی بەڵێ ئازاری من بەقەد ئازاری دوو پیاوە لەئێوە، گوتم کەواتە پاداشیشت دووقاتە،

لەدرکێکەوە تاگەورە تر دەبێتە ڕەشبوونەوەی تاوان هەروەك گەڵا چۆن لە درەخت دەوەرێت. عن عائشة قالت لما اشتد وجعه، قال حبوا علی من سبع قرب لم تحلل او لیتهن لعلی استریح فاعهد الي الناس، قالت عائشة فأجلسناه في مخضب لحفصته من نحاس وسكبنا علیه الماء حتی طفق یشیر علینا ان قد فعلتن ثم خرج فقام یومئذ خطیبا فحمد الله واثنی علیه واستغفر للشهداء الذین قتلوا یوم احد. دەگێڕنەوە لەعائشە گوتی کاتێ نەخۆشی پێغەمبەر کوشندە بوو، گوتی بڕۆن هەفت کوندە ئاوم بۆ بهێنن لەهەر هەفت کوندەکە یەکایەك ئاویان بەسەردادەکرد.

عائشە دەڵێت: لەدەوروبەری دانیشتین، حفصەی خێزانی مەنجەلێکی هەبوو لەمس بوو ئاوەکەمان بەسەریدا ڕژاند تاخۆی ئاماژەی کرد بەسسە، ئیدی دواتر هەڵسایەوەو سوپاسو ستایشی خودای کردو داوای لێخۆشبوونی لەخودا کرد بۆ جەنگاوەرانی احد.

بزانە پێغەمبەر(ﷺ)ی خۆشەویست لەسەرە مەرگدا، سێ نەخۆشی رووی تێکرد- لەرزوتا- ژانەسەر- ژەهری گۆشتەکە، سوودی ئەم ئاوەش ئەوەیە کەوا هەموو نەخۆشیەك لادەبا هەتا جادووشی دەگەڵدا بێت.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی، لەهەموو کەسێکەوە گرفتی پتر بێت پێغەمبەرانن، ئینجا پێ پێ لەئەوان بەروە خوار تر پیاو بەئەندازەی ئایینەکەی گیرۆدە دەبێت.

پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرە مەرگدا هەفت دیناری زێڕی هەبوو، لەلای عائشەی دانابوو، گوتی ئەی عائشە بڕۆ ئەم هەفت دینارە بگەیەنە دەست پێشەوا علی بابیکاتە خێر، بەڵام هەرکاتێ ئەم قسەیەی بەعائشە رادەگەیاند لەخۆی دەچوو، تاسێ جاران، لەدواتر عائشە پارەکەی بردە لای پێشەوا علي و ئەویش کردیە خێر(٩٢).

لەدوا دوایی مانگی صفری ساڵی ١١ کۆچەری پێغەمبەرمان گیرۆدەی دەردی (تا) بوو، سیانزە رۆژی خایەند، هەر رۆژەی دەچووە ماڵی خێزانێك لەخێزانەکانی. لەپاش ئەوەی نەخۆشیەکەی کوشندە تربوو یەکە بەیەکە بەخێزانەکانی گوت: ئەگەر رێم بدەن، با نەخۆشیەکەم لەماڵی عائشە بێت! هەر هەموویان ڕێیان پێدا، کاتێك توانای ئەوەی نەمابچێتە مزگەوت، فەرمووی بانگی ابوبکر بکەن، بۆ ئەوەی بەرنوێژیتان بۆ بکات، یارمەتی دەران لەداخی پێغەمبەردا لەناو مزگەوتدا

دەسوڕانەوە، پێغەمبەریش ئالەم کاتەدا بەسەری پێچراوە هاتە مزگەوت و هەنگاوی دەنا علی و فضل دەستیان گرتبوو، عباس لەپێشی دەڕۆیشت تالەنزیك مینبەروە دانیشت و جەماوەری هاوەڵان دەورەیان گرت، لەپاش سوپاس و ستایشی خودا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەی خەڵکینە! پێم گەیشتووە کەوا ئێوە بەهۆی مەرگی پێغەمبەرەکەتان ترس دایگرتوونە، ئایا هیچ پێغەمبەرێك لەپێش منەوە ژیاوە؟ من بەدوای پێغەمبەرانەوە دەچم، ئێوەش بەدوای منەوە دێن، ئەی کۆچەرو یارمەتیدەران! هەر هەمووتان رادەسپێرم بەکاری چاك، گەیشتنەوەی من بەئێوە لەسەر (حوض الکوثرە)ە، جاهەر کەسێك پێی چاکە بەسەر بەرزیەوە پێم بگاتەوە، باپارێزی دەست و زاری خۆی بێت، لەبەرەبەیانی رۆژی دووشەممەی ١٣ مانگی ربیع الاول کە موسلمانان لەنوێژی بەیانیدا بوون، ابوبکر بەرنوێژی بۆ کردن پێغەمبەریش لەژووری عائشە بوو، کولانکەکە دەیڕوانیە ناو مزگەوت بۆیە پێغەمبەر بەخەندەوە روانیە نوێژکەران ابوبکر مەزەندەی وابۆ چوو" کەوا پێغەمبەر بۆ نوێژ دێت" هاوەڵان لەشادیانەی هاتنی پێغەمبەر نەیاندەزانی چی بکەن... پێغەمبەریش بەئاماژەوە گوتی نوێژی خۆتان تەواو بکەن، پاشان گەڕایەوە ژوورەکەی عائشەو دایا نپۆشی و مەرگ هاتە لای، سەری پیرۆزی لەسەر ڕانی عائشەی خێزانی بوو دەیگوت (اللهم الرفیق الاعلی) هێشتا رۆژ دەرنەکەوتبوو گیانی بەخوداوە سپارد ابوبکر ئامادەنەبوو لەکاتی مەرگی پێغەمبەر، چونکە ماڵی لەماڵێ عائشە نزیك نەبوو، کاتێ هەواڵی بۆ چوو هاتە لای پێغەمبەر وسەری والآ کردوو هەڵگێڕو وەرگێڕی دەکردو ماچی دەکردو دەیگوت (صلوات الله علیك یارسول الله ماأطیبك حیا ومیتا). ئینجا ابوبکر چووە ناو خەڵك وتاری داو گوتی هەرکەسێك محەمەد دەپەرستی ئەوا محەمەد مرد، ئەگەر خوداش دەپەرستێ ئەوا خودا زیندووەو نامرێ.

لەپاشان پێغەمبەر لەرۆژی دووشەممە تائێوارەی شەوی چوارشەممە، تاموسلمان جێنیشیان بۆخۆیان هەڵبژاردو پێشەوا علي شۆردی و عباس و فضل و قثم اسامەی زید شقران، ئەمانە هەر هەموویان یارمەتی شۆردنی پێغەمبەریاندا، خەڵاتی پێغەمبەر سێ پۆشینە بوو، کراس ومێزەری دەگەڵدانە بوو لەسەر تەخت دانرا لەماڵەکەی خۆی، ئینجا لەژووری عائشە گۆڕیان بۆ هەڵکەند پێشەوا (علی و عباس دەگەڵ هەردوو رۆڵەی عباس واتا الفضل و القثم) چوونە ناو گۆڕەکە، دواتر گۆڕی

پێغەمبەر بستێ لەزەمینەوە بەرزتربوو ٥٣ ساڵی لەشاری مکە بردە سەر، ١٠ سالیش لەشاری مدینە کەواتە تەمەنی ٦٣ ساڵ بوو[٩٣]. لەهەمانکاتدا شیاوە بگوترێت تەمەنی پێغەمبەر ٦١ ساڵ بووە، هەروا ٦٣ ساڵ بووە. واتا بەپێی ساڵنامەی زایینیو کۆچەری ئەم جیاوازییە دێتە بەرچاو، بۆ نموونە پێغەمبەر بەپێی بەرواری ساڵی زایینی لەساڵی فیلدا لەدایك بووە کەرێکەوتی ١٨تا ٢٠/٤/٥٧١ زایینییە، کۆچی دوایشی ٨/ تموزی ساڵێ ٦٣٢ زایینی بووە جائەگەر ئەم دوو مێژووە لەیەك دەربکەین بەرۆژو مانگو ساڵەوە، دەبینین یەکسانە بە٦١ ساڵو ٤٩ رۆژ بەڵام ئەگەر ئەم ساڵو ٤٩ رۆژە کۆبکەینەوە دەکاتە ٢٢٣٣٠ رۆژ ساڵی کۆچیش ٣٦٧ر٣٥٤ رۆژە، کەچی ساڵی زایینی ٣٦٥ رۆژە، ئیدی بەدابەشکردنی سەرجەم رۆژەکان بەسەر رۆژەکانی ساڵی کۆچەری دا واتا ٢٢٣٣٠ رۆژ ÷ ٣٦٧ر٣٥٤ دەکاتە ٦٣ ساڵو پێنج رۆژ[٩٤].

بزانە پێغەمبەری خودا لەحەجی ماڵئاوایی ٦٣ وشتری سەربڕی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ٦٣ ساڵی تەمەنی ئەم سەروەرە، پێغەمبەرە، خاوەن تانجە- ژیانو مەرگی قازانجە- خاوەن (الکوثرە- ڕەوانکراوو رەهبەرە( ئەمینو بەرێزە).

روی ان لما دفن رسول الله، قالت فاطمة اطابت نفوسکم ان تحثو علی رسول الله التراب، واخذت من تراب القبر الشریف ووضعته علی عینیها وانشأت تقول

ماذا علی من شم تربة احمد
ان لایشم مدی الزمان غوالیا
حبت علی مصائب لوأنها حبت
علی الایام صرت لیالیا

دەگێرنەوە کاتێك پێغەمبەریان شاردەوە فاتیمەی کچی پێغەمبەرمان گوتی چۆن دەتوانن خۆڵ بەسەر پێغەمبەر دابکەن، بۆیە هەندێ: خۆڵی گرتە دەست و لەسەر چاوانی داناو سروودەکەی خوێندەوە[٩٥]،

# فەرهەنگی کتێب

**ألبدر:** جەنگێك بوو لەشاری مکە لەنێوان هاوەڵان و بێباوەڕاندا.
**بصري:** سەرەتا كۆشكێك بووله وڵاتی شامدا واتا خانوێكی مەزن بوو، بووە شار.
**بضاعة:** ناوی بیرێك بوو له شاری مدینەدا.
**بطعان:** ناوی شوێنێكە لەشاری مەدینەدا **بقيع** : ناوی گۆڕستانێك بوو لەمەدینە هەر وا درەختێك هەیە لەئەوێ بەئەم ناوە.
**أبو أمامة الباهلي:** ناوی صدی عجلان بوو.
**ابو الأيوب الأنصاري:** ناوی خالدی زید بوو.
**ابو بردة:** یا ابو موسى الأشعرى ناو الحارث یان عامر بوو.
**ابو بشير الانصاري:** ناوی قيسی عبيد بوو.
**ابو الدرداء:** ناوی عويمر بوو **ابو ذر:** ناوی جندب كوڕی جنادةبوو.
**ابو رافع:** بەندەی پێغەمبەر بوو، ناوی الصائغ نفيع بوو، موسلمانبووە.
**ابو سعيد الخدري:** ناوی سعدی مالك سنان بوو **ابو طلحة:** ناوی زيدی سهلی الانصاری بوو.
**ابو عبيدة بن الجراع:** ناوی عامری عبدالله بوو.
**أبو قتادة الانصاري:** ناوی الحارث بوو، یان نعمان .
**ابو لبابة الانصاري:** ناوی بشير بوو یان رفاعة.
**ابو هريرة:** ناوی عبدالرحمانی صخربوو.
**ابن الزبير:** عبدالله **ابن خطاب:** عمر
**ابن شبرمة:** عبدالله.
**أبرهة:** سەركردەی ئەوفیلانە بوو بۆ وێرانكردنی شاری مككه هاتبوون.
**الأبواء:** كێوێكە. **كعب الأحبار:** الاحبار كۆی حبرای واتا زانا كعب ناوی ئەوە.
**الأزد:** ناوی هۆزێكە.
**اياد ابو السمع:** خادمی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.
**الانصار:** هەردوو هۆزی الاوس والخزرج.
**البراء بن عازب:** هاوەڵی پێغەمبەر بوو. **برويز:** نامەی پێغەمبەری دڕاند.

**بريرة:** خزمەتکاری عائشە بوو.
**بقيع:** گۆرستانێکە لەشاری مدینە.
**البغوی:** لەبنەچەدا ناوی شاری بغشورە لەخراسان، بغوی خەڵکی ئەو شارەیە.
**تهامة:** لەخوارووی نجدە. **الترمذی:** واتا ناوی شاری ترمذە ئەم شارە لەپشت جیجونە.
**ثوبية:** کارەکەری أبو لهب کەدایکی شیریی پێغەمبەربووە، کێشەهەیە لەموسڵمانبوونیدا.
**الجحفة:** شوێنێکە لەنێوان شاری مکەو مدینەدا.
**ابو جحيفة:** کونیەی وهب بن عبدالله بوو.
**جهينة:** ناوی تیرەیێکە
**الحباب:** کونیەی عبدالله ابی بوو.
**أبو حمزة:** کونیەی انسی مالکە.
**حوران:** ناوی شارێکە
**خزاعة:** ناوی تیرەیێکە
**ابو دجانة:** کونیەی ناوی شمان کوڕی خرشە.
**دومة الجندل:** شوێنێکە لەنێوان شامو حجازدا پادشاکەیان اکیدر بوو.
**الربذة:** شوێنێکە لەنزیك مدینە. زوراً : شوێنێکە لەنزیك شاری مەدینە.
**ابو السائب:** کونیەی عثمانی کوڕی مظعونە .
**سراقة بن مالك بن جعشم.** صهيب بن سنان الرومی
**الشفاء:** دایکی عبدالرحمانی عوف بوو.
**ابو المهباء:** کونیەی عکراش ذويب.
**ضمام:** ناوی دۆستێکی پێغەمبەر بوو، ئەم پیاوە لەسەردەمی نەفامی دۆستی پێغەمبەر بوو، پیاوێکی بێ خەوش و گەڕیدەی زانست بوو، هەر لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلامدا بەهۆی بینینی قورئانی پیرۆزەوە موسلمانبوو.
**ابو طليحة:** کونیەی قیس عاصم و طليحة الاسدية.
**الطائف:** شارێکە لەوڵاتی حجازدا.
**عاصية:** کچی ثابت پێغەمبەر ناوی گۆڕی بۆ جميلة.

**عبهلة:** ناوی الاسودی العنسی بوو، داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد.
**عكاشة محصن:** یەکێکە لەهاوەڵە ناودارەکان .
**عكاظ:** ناوی بازێرێك بوو لەمکەدا.
**الغفاری:** نسبەتە بۆ غفاری ملیل.
**فلسطین:** ولاتێکە لەنێوان شامو مصردا .
**القادسية:** شارێکە دوو قۆناخ لەکۆفە دوورە .
**القُثم:** یەکێکە لەناوەکانی پێغەمبەر(ص).
**ابو قحافة:** ناوی باوکی ابوبکر لەفەتحی مکە موسلمانبووە، لەسالّی ١٤ کۆچەریدا لەتەمەنی ٩٧ سالّیدا مردووە، قباء: شوێنێکە لەنزیك شاری مدینە.
**قری:** شوێنێکە دوو قۆناغی لەمکەوە.
دوورە **ابو قلابة:** کونیەی عبدالله بن زید بوو.
**قیصر:** ناز ناوی پادشایانی رۆمانە.
**کسری:** نازناوی پادشای فارسە ناوی تەواوی خوسرەوە.
**لبیدبن الاعصم:** جادووی لەپێغەمبەر کرد.
**ابو محذورة:** بانگدەری پێغەمبەر .
**معیرة :** باوکی عبدالملك بوو.
**مدعم:** بەندەیەکی رەشپێستی پێغەمبەر بوو.
**المهاجر:** ئەو هاوەلانە بوون کەکۆچیان کرد.
**النجاشی:** نازناوی پادشای حبشە بوو، خەڵکی حبشە ئێژێ النخاشی.
**وحشی کوڕی حرب** بکوژی پێشەوا حمزە بوو، هەروا لەپاش موسلمانبوونی بکوژی مسیلمە الکذاب بوو.
**ام هانيْ :** خوشکی پێشەوا علی بوو.
**هبل:** ناوی بتێکە. هرقل: ناوی پادشای رۆم بوو.
**الهرمذان:** پیاوێکی فارس بوو بەشداریکرد لەشەهید کردنی پێشەوا عمر.
**الهاشمی:** باوانی پێغەمبەر .
**الهجر:** ناوی شارێکە.
**یمامة:** ناوی شارێکە لەولاتی یمن دا[٩٦].

# تێبینیو سەرچاوەکان

خوێنەری هێژا تکایە ئەم پیتانەی کەلەناو پەراوێزەکان هەیە، لەبەرکورتکردنەوە تەنها پیتێک یان دوو پیتی ناوی سەرچاوەکەمان نووسیوە، بۆیە لێرەدا هێماکان دەست نیشان دەکەین.

| پیت | ناوی سەرچاوەکە |
|---|---|
| ق | القران الكريم |
| ن | نور الابصار |
| ش | الشجرة المحمدية |
| م | ملخص السيرة النبوية |
| خ | خۆری ئیسلام (گۆڤار) |
| د | دەنگی زانا (گۆڤار) |
| إ | ارشاد الساري |
| شو | مەولود نامەی شوانی |
| ت | التربية الاسلامية (مجلة) |
| س | سەرگوزشتەی پێغەمبەر |
| ج | التاج |
| اعا | اعانة الطالبين |
| مع | المعجزات الامحمدية |
| غا | غاية السول في سيرة الرسول |
| پ | ئەوەتانە پۆپەی مەرام |
| ص | الصفحات المشرقة |
| ر | التفسير الكبير (الرازى) |
| اث | ابن كثير |
| تن | تنوير الاذهان |
| ك | كۆڕی زانیاری کورد ( گۆڤار) |
| نز | نزهه المجالس |
| ريا | رياض الصالحين |
| اس | اسماء الرجال |
| اسر | الاسراء والمعراج |

# پەراوێزەکان

١- م
٢- ن
٣- م
٤- م
٥- ن
٦- ن
٧- ن
٨- م
٩- ن
١٠- م
١١- ن
١٢- ش
١٣- ن
١٤- ق
١٥- ق
١٦- ن
١٧- ن
١٨- ن
١٩- خ
٢٠- إ
٢١- د
٢٢- شو
٢٣- ت
٢٤- م
٢٥- م
٢٦- م
٢٧- م
٢٨- س
٢٩- خ
٣٠- خ
٣١- ج
٣٢- ج
٣٣- د
٣٤- د
٣٥- ت
٣٦- ت
٣٧- خ
٣٨- ت
٣٩- ج.ن
٤٠- ق
٤١- س.ر
٤٢- س
٤٣- س
٤٤- د
٤٥- ر
٤٦- إ
٤٧- إ
٤٨- ق
٤٩- ت
٥٠- إسر
٥١- تن
٥٢- اث
٥٣- إ
٥٤- إ
٥٥- ج
٥٦- اعا
٥٧- إ
٥٨- ريا
٥٩- اعا
٦٠- د
٦١-
ت.ك.نز
٦٢- مع
٦٣- ن
٦٤- س.ش
٦٥- س.ش
٦٦- س.ش
٦٧- غا
٦٨- ش.س
٦٩- ن
٧٠- ش.س
٧١- د
٧٢- ن
٧٣- ش
٧٤- ش
٧٥- ش
٧٦- س.
ش. غا
٧٧- ن
٧٨-
س.ش
٧٩- غا
٨٠-
ن.ش.س
٨١- ن
٨٢- غا
٨٣- ت
٨٤- ج
٨٥- ت
٨٦- ن.ت
٨٧- اث
٨٨- إ
٨٩-
ت.پ.د.
ن.ص
٩٠- س.
ش
٩١- خ.ت
٩٢- د
٩٣- م
٩٤- خ
٩٥- ن
٩٦- ا

# نـــاوەڕۆك